# شیکردنەوەی مەنزومەی

# بەیقونی

عمر بن محمد بن فتوح البيقوني الدمشقي ت ١٠٨٠ هـ

لە نوسینی: م. عبدالرحمن شمس الدين زاری

١٤٤٢ ی هیجری

ئەکادیمیای گەنجینەکانی سوننەت

بۆ ئاستە شەرعیەکان

# شیکردنەوەی مەنزومەی بەیقونی لە زانستی زاراوەی فەرمودە


کۆکردنەوە و نوسینی:

م. عبدالرحمن شمس الدین نزاری



ئەکادیمیای گەنجینەکانی سونەت بۆ زانستە شەرعیەکان

کەناڵی تیلیگرام: https://t.me/daralulum

فیسبوک: https://www.facebook.com/IBNSALAH.ISLAMIC.ACADEMY/

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

**الحمد لله رب العالمين و العاقبه للمتقين و الصلاه و السلام على نبينا محمد و على اله و صحبه أجمعين**

**أما بعد،**

**لە میانەی خولەکانی بنەرەتی لە زانستە شەرعیەکان لە پەیج و کەنالی پاشکەوتەکانی سونەت بۆ زانستە شەرعیەکان و لە بواری فەرمودەناسی وەك سەرەتایەك مەنزومەی بەیقونیمان هەلبژارد کە پەیوەستە بە زاراوەکانی فەرمودە.**

**ئەم مەنزومە لە گەل ئەوەش کە کورتە بەلام لە دێر زمانەوە گرنگی زۆری پیدراوە و لە زۆرێك لە قوتابخانەکانی فەرموودەناسی لە وولاتانی موسلمان وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی لە خولە سەرەتاییەکاندا پشتی پی بەستراوە.**

**گرنگی ئەم مەنزمە لەوەدایە کە زۆر بە کورتی لە زاراوە سەرەکیەکانی زانستی فەرمودەناسی دەدوێت و لە بەر کردن و تێگەیشتنی لە لایەن فێرخوازانی زانستی شەرعی لە ئاستی سەرەتایی ئاسانە.**

**لە گەل کورتی و پوختی ئەم مەنزومەیە گرنگی دراوە بە شیکردنەوەی ئەم مەنزومەیە و زۆر پەرتوکی لە سەر نوسراوە کە ئاماژە بە هەندیکیان دەکەین بۆنمونە:**

- **فتح القادر المعين بشرح منظومة البيقوني في علم الحديث، کە لە دانانی شيخ عبدالقادر بن جلال الدين المحلى يە.**
- **(تلقيح الفكر بشرح منظومة الأثر) لە دانانی أحمد بن محمد الحسينی الحمودی الحنفی يە**

**- (صفوة الملح بشرح منظومة البيقونية في فن المصطلح) لە دانانی زانای پایەبەرز شمس الدين محمد بن محمد البديری الدمياطي کە ناسراوە بە بابن الميت (١١٤٠ هـ)، ئەم پەرتوکە بە گرنگترین شیکردنەوەی مەنزومەی بەیقونی دادەنریت.**

- **(حواشي على المنظومة البيقونية) لە دانانی العلامه عبد الرحمن بن سليمان ابن يحيى الأهول (١٢٥٠ هـ)**
- **(الدرة البهية في شرح المنظومة البيقونية) دانانی عەلامە محمد بدر الدين بن يوسف المدنی الدمشقی (١٣٥٤ هـ)**
- **(النخبة النبهانية شرح المنظومة البيقونية) دانانی شيخ خلفيه بن محمد النبهانی (١٢٦٩هـ)**
- **التقريرات السنية شرح المنظومة البيقونية) دانانی العلامه حسن ابن محمد المشاگ المكی (١٢٩٩ هـ) کە چەندین جار چاپ کراوە**
- **(حاشية الأجهوري على شرح الزرقاني) هي شيخ عطية الأجهوري**
- **(السهل المسهل) هی شيخ سيف الرحمن أحمد**
- **شەرحی عبدالله سراج الدين**
- **الزهره السميه ی شيخ خالد الجزمائی، ئەمە دەستنوسە لای پەیمانگەی دەستنوسە عەرەبیەکانە**

- البهجة الوضية ی شيخ محمود بنشابه ١٣٠٨ ه
- شیکردنەوەی بەیقونیە لە زاراوەی فەرمودە لە دانانی شیخ ابن عثیمین رەحمەتی خوای لی بیت
- الثمرات الجنية شرح المنظومة البيقونيه ی شیخ بدالله بن جبرين
- الأمالي المكية ی شیخ سليمان العلوان
- مذكرة في شرح البيقونيه ی شیخ صالح الاسمری
- الدرر النقيه في شرح المنظومة البيقونیەی شیخ ئەحمەد بن حمود الخالدی
- مذكرة في شرح البيقونية ی شیخ محمد بن ابراهيم الجزائری
- شیکردنەوەی سعد الحميد کە بە کورت ترین شیکردنەوە دادەنریت
- شیکردنەوەی محمد بن عبدالباقی الزرقانی ت ١١٢٢ هـ کە لە لایەن ئەزهەر و فوتابخانە فەرمودەناسیەکانی وولاتی یەمەن دەوینریت.
- شیکردنەوە حسن بن محمد المشاط ١٣٩٩ هـ
- شیکردنەوە محمد سراج بن محمد سعيد الجبرتی الانی
- السامسونيه في شرح البيقونیەی أبو عبدالله ليپ الحيالی

لە وانەیە شیکردنەوەی تریش هەبیت لە سەر ئەم مەنزومەیە

تیبینی: ناوی ئەم پەرتوکانە لە شەرحی صفوه الملح بە تەحقیقی أبو مالك محمد بن حامد بن عبدالوهاب دا هاتووە.

بە پشت بەستن بە الله تعالی هەول دەدەین بە کەلك وەرگرتن لە شیکردنەوەکانی خەلکی تر بە تایبەت شەرحی صفوة الملح ی دمیاطی ( ١١٤٠ ه)، هەروەها چەند پەرتوکیکی تایبەت بە زانستی زاراوەی فەرمودە  بە سەرچاوە وەرئەگرین وەك کتابەکانی: الباعث الحثيث شرح اختصار علوم الحديث ی حافظ ابن كثير، تيسير مصطلح الحديث ی د. محمود طحان و  ( الميسر في علم مصطلح الحديث ی ماجد الغوری) و بێ گومان وەك رێچکەی زانایای پیشوو چاویك دەخشینە پەرتوکە بە ناوبانگەکەی مصطلح الحدیپی زانای فەرمودەناسی پایەبەرزی کورد ابن صلاح الشهرزوری رەحمەتی خوای تعالای لی بیت.

لە بەر ئەوەی ئەم خولە و ئەم پەرتوکە بۆ قوناغی بنەرەتی تایبەت کراوە هەول دەدەین بە ئاسانترین شێواز دەستەواژەکان شی بکەینەوە کە واتا بەخش بیت و لە هەمان کات دا کورت و دەربڕ بیت.

فێرخوازانی خۆشەویستمان لە زانستە شەرعیەکان و بە تایبەت ئەو بەرێزانەی کە ئارەزومەندن لە بواری فەرمودە ناسی بخوێنن هان دەدەین کە هەول بدەن مەتن و مەنزومە و دەقە کورتکراوەکانی هەموو بوارەکان لە بەر بکەن بە تایبەتی مەنزومەی بەیقونی کە رەنگە کورت ترین دەق بیت لە بواری فەرمودەناسی پیویستە لە بە ر بکریت.

## زانستی زاراوەی فەرمودە ( مصطلح الحديث):

فەرمودە وەك دووەم سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلام زۆر گرنگە و سەرەرای ئەوەی کە بەشێکی زۆری ئەحکامی شەریعەتی لێ وەردەگیرێت، سەرەکیترین و برواپێکراو ترین سەرچاوەی راڤە کردنی قورئانی پیرۆزە. هەلبەت لە پێناو پاراستنی سونەتی خۆشەویستمان صل الله علیه و سلم لە دەستێوەردانی کەسانی نەفام و نەیار و نیازگلاو، زانایان هەر زوو لە سەردەمی هاوەلان گرنگیان بە سەنەدی فەرمودە داوە بە تایبەت لە سەردەمی تابعین و سەرهەلدانی فیتنەکان ئەم گرنگی پێدانەش بەرجەستە تر بوو. مێژووی نوسینەوەی فەرمودەکان و چۆنیەتی و هەروەها گرنگی پێدانی سەنەدی فەرمودە و لێکولینەوە لە راستگۆیی راویەکان بابەتێکی ترە و خۆی لە زانستی علم الرجال و الجرح و التعدیل دەبینیتەوە کە پێویستە لە کاتی خۆی بە درێژی ئاماژەی پێ بدرێت بۆیە ئێمە لە پێناو پاراستنی کورت برِی لێرە لێ ی نادوێن. بەلام سەبارەت بە زانستی زاراوە ئەوەندە دەلێین کە ئەم زانستە دوای گەلالە بوونی بنچێنە سەرەتاییەکانی زانستی فەرمودە ناسی و جیا کردنەوەی جۆرە کانی فەرمووده و ئەو عیللەتانەی کە لە ناو سەنەد و دەقی هەندێ لە فەرمووده هەیە و هەروەها تایبەتمەندیەکانیان پەیدا بوو، بە تایبەت کاتێك بۆ ناسینەوەی زاراوەکان و واتای زاراوەکان لای هەر زانایەك پێویست بۆ زاراوەی ستاندەر بهێتە کایەوە تا هەموو زانایان زمانێکی فەرمودەناسی تاقانەیان هەبێت. بەلگەکانیش لە رووی دەقە شەرعیەکان بۆ لێکولینەوە لە فەرمودە و گرنگیپیدان بە فەرمودە و گیرانەوەی لە قورئان و سونەت دا هاتووە: الله تعالی لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

**﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ﴾** [الحجرات: ٦]،

هەروەها پیغەمبەری خۆشەویست دەفەرموێت: - ﷺ -: **((نضّر الله امرأً سمع منّا شيئًا فبلّغه كما سمعه، فرُب مُبلَّغٍ أوعى من سامع))** لە ریوایەتیکی تر هاتووە: **(( فرُبَّ حامل فقه إلى مَن هو أفقه منه، ورب حامل فقه ليس بفقيه))**.

واتە خوای تعالی دەم و چاوی ئەو کەسە گەش و نورانی بکات کاتێك شتێك لە منەو ە دەبیستن وەك خۆی رایبگەینن، لە وانەیە ئەوەی پێ ی رادەگەینیت لە و کەسەی کە بۆی دەگێریتەوە شارەزا تر بیت لە رووی تێگەیشتنەوە.

سەرەتا ئەم زانستە وەك زانستێکی سەربەخۆ نەبوو بەلکو لە ناو هەندێ کتێبی شەرعی باس لە هەندێ بابەتی ئەم زانستە کراوە وەك کتابی ( رسالە ی ئیمامی شافیعی رەحمەتی خوای لی بیت)، بەلام دواتر وەك زانستیکی سەربەخۆ کتابی بۆ نوسرا و یەکەم کەس کە ئەم کارەی کردبیت أبو محمد الحسن بن عبدالرحمن بن خلاد الرامهرمزی بوو کە کتابیکی بە ناوی المحدِّث الفاصل بين الرَّاوي والواعي – دانا. ئینجا کتابی تر لەم بابەتە دانرا وەك : کتاب – معرفە

علوم الحديث – ی حاکم نیشابوری و کتابی – الکفایه فی علم الروایه- ی خەتیبی بەغدادی و کتابی قازی عەیاز - الإلماع الي معرفة اصول الرواية و تقييد السماع- و کتابی أبو حفص المیانجی و کتابی بە ناوبانگی زانای کوردی فەرمودەناس أبو عمرو عثمان بن الشيخ صلاح الدين عبدالرحمن بن عثمان بن موسى الكردى الشهرزوری الشافعی کە بە ابن صلاح بە ناوبانگە بە ناوی – مصطلح الحدیث- و هتد.

بە لام کورت ترین کتێبەکان لە م بوارە دەتوانین باس لە – نخبة الفكر و نزهة النظر – ابن حجر عسقلانی بکەین هەروەها کتابی – الموقظة- ی ئیمامی زەهەبی رەحمەتی خوایان لی بیت کە گەر عومر باقی بیت لە داهاتوو ان شاو الله تعالی پێمان خۆشە بە ریوایەت و دیرایەت شییان بکەینەوە.

## هەندێ زانیاری سەرەتایی دەربارەی زانستی فەرمودەناسی:

پێش ئەوەی دەست بکەین بە شیکردنەوەی بەیتەکان پیویستە هەندێ دەستەواژە شی بکەینەوە لە وانە:

- **زانستی مصطلح الحدیث** واتە زاراوەی فەرمودە: بریتیە لە زانینی ئەو بنچینە و بنەمایانە کە بە هۆیانەوە چۆنیەتی سەنەد و مەتن واتە دەقی فەرمودە دەزانرێت لە رووی قبول کردن یا رەت کردنەوەیان
- **حدیث** واتە فەرمودە بە مانا لە زمانی عەرەبی واتە نوێ و لە رووی زاراوەیی: بریتیە لە قسە، کردەوە، رازی بوون یا ئاکاریکی جەستەیی یا رەفتاری کە بدرێتە پالِ رسول الله صل الله علیه و سلم.
- **خبر**: لە رووی زمانەوانی واتە هەوال و لە زاراوە ٣ قسە هەیە لە سەری:
  ١. هاو واتایە لە گەل فەرمودە
  ٢. مانای جیاوازە، فەرمودە ئەوەی لە لایەن رسول الله بێت صل الله علیەو سلم و خبر لە لایەن غەیری ئەو
  ٣. گشتی ترە: واتە خبر لە لایەن رسول الله صل الله علیه و سلم و غەیری ئەویش بیت
- أثر: لە زمانەوانی: واتە ئاسەوار و لە زاراوە دوو قسە هەیە:
  ١. هاواتای فەرمودەیە
  ٢. جیاوازە: بریتیە لەوەی دەدریتە پال هاوەلان و تابعین لە قسە و کرەوە
- **إسناد**: دوو واتای هەیە
  ١. فەرمودە بدرێتە پال ئەوەی ووتویەتی بە سەنەدەوە
  ٢. زنجیرەی ئەو پیاوانەی کە دەگەیەنیتە دەقەکە، و بەم واتایە مەبەستی پیێ سەنەدە.
- **سند**: لە زمانەوانی: واتە پالپشت و لە زاراوە دا: زنجیرەی ئەو پیاوانەی کە فەرمودە دەگیرنەوە هەتا دەگاتە دەقەکەی
- متن: لە زمانەوانی واتە: ئەوەی لە سەر زەوی هەلدەستێت و بەرزدەبێتەوە و لە زاراوە: بریتیە لە و گوتەی کە سەنەد پیێ دەگات و کوتایی پیێ دێت.

- **المسند**: اسم مفعوله واتە ئەوەی شتێك بخاتە پالی و لە رووی زاراوە ٣ واتای هەیە:

١. هەر کتابیك کە تیایدا گێرانەوەی هەر هاوەلیك بە جیا تیایدا کۆکرابیتەوە وەك موسنەدی ئیمامی ئەحمەدی حەنبەل رەحمەتی خوای لی بیت

٢. فەرمودەیەك کە مەرفوعە واتە دەگاتە پیغەمبەری صل الله علیە و سلم بە سەنەدی متصل ەوە لە رووی قسە و کردەوە و رازی بوون و ئاکاراوە.

٣. یا واتای سند بریتی بیت لە زنجیرەی سند و چاوگیکی میمی بێت ( مصدر میمی).

- **محدث**: برتیە لەو کەسەی کە سەرقالە بە زانستی فەرمودە لە رووی دیرایە ت و ریوایە ت، و ئاگادارە لە سەر زۆربەی ریوایەتەکان و حالی راویەکان و ئەوەی دەیزانیت زیاترە لەوەی نایزانیت

- **حافظ**: دوو قسەی لەسەرە:

١. هاوواتایە لە گەل محدث لە لای زۆربەی فەرمودە ناسان

٢. دە لین پلەیەکە لە محدث بالا ترە بە جۆریك لە هەر تەبەقە ( توێژی راویەکان) ئەوەی دەیزانیت زیاترە لەوەی نایزانیت

- **الحاکم**: ئەوەی کە زانیاری هەیە لە سەر گشت فەرمودەکان بە جۆریك شتیکی کەم نەبیت لیٚ ی وون نیە ئەمەش لە سەر رای بەشیك لە زانایان

- زانستی فەرمودەناسی بۆ دووبەش دابەش دەبیت:

١. زانستی ریوایەتی فەرمودە، برتیە لە گێرانەوەی فەرمودەکان

٢. زانستی تێگەیشتن لە فەرمودە ( دیرایە ت) ، بریتیە لە لیکولینەوە لە حالی( راوی و مروی) واتە ئەوی دەگیریتەوە و ئەوەی دەگیردریتەوە لە رووی وەرگرتن و رەت کردنەوە.

## مەنزومەی بەیقونی و دانەرەکەی:

ئەم دەقە شیعریە لە بواری زاراوەی فەرموەیە و لە دانانی **عمر بن محمد بن فتوح البیقونی الدمشقی الشافعیە** (پێش سالی ١٠٨٠ هـ زیندوو بووە واتە سالی کۆچی دوایی دیار نیە) کە ٣٤ بەیتە. بیقون ناوی گوندێکە لە هەرێمی ئازربیجان، نزیك کوردەکان ( بە پیی قسەی شیخ بدرالدین الحسنی لە کۆتا لاپەرەی شەرحەکەی بە ناوی ( الدرر البهیە).

ئەم مەنزومەیە سەنەدەکەی ناگاتەوە دانەرەکەی بەلکو سەنەدەکە تایبەتە بە ئەوانەی کە دەقەکەیان شیکردتەوە و سەنەدی ئیمەش دەگاتە ئیمامی زورقانی رەحمەتی خوای لی بیت.

## دەقی مەنزومە:

١ . أبدأُ بالحمدِ مُصَلِّياً على     مُحَمَّدٍ خَيرِ نبِيٍّ أُرسِلا

٢ . وذي مِنَ أقسَامِ الحديث عدَّة     وكُلُّ واحدٍ أتى وحَدَّه

٣ . أوَّلُها (الصحيحُ) وهَو ما اتَّصَل     إسنادُهُ ولَمْ يشَذّ أو يُعَلّ

٤ . يَرْويهِ عَدْلٌ ضَابِطٌ عَنْ مِثْلِهِ     مُعْتَمَدٌ في ضَبْطِهِ ونَقْلِهِ

٥ . و(الحَسَنُ) المعْروفُ طُرْقاً وغَدَتْ     رِجالُهُ لا كالصّحيحِ اشْتَهَرَتْ

٦ . وكُلُّ ما عَنْ رُتبةِ الحسْنِ قَصُر     فَهْوَ (الضعيفُ) وهَو أقْساماً كُثُر

٧. وما أُضيفَ للنبي (المَرْفوعُ)     وما لتابِعٍ هُوَ (المقْطوعُ)

٨ و(المُسْنَدُ) المتَّصِلُ الإسنادِ مِنْ     راويهِ حتَّى المُصْطفى ولَمْ يَبِنْ

٩ . وَما بِسَمْعِ كُلِّ راوٍ يتَّصِل     إسْنادُهُ للمُصْطَفى فـ(المُتَّصِل)

١٠ . (مُسَلْسَلٌ) قُلْ ما عَلَى وَصْفٍ أتَى     مِثْلُ أَما واللهِ أنْبأني الفَتَى

١١ كذاكَ قَدْ حَدَّثَنِيهِ قائِماً     أوْ بَعْدَ أنْ حَدَّثَني تَبَسَّما

١٢ . (عَزيزٌ) مَرويُّ اثنَينِ أوْ ثَلاثَه     (مَشْهورٌ) مَرويُّ فَوْقَ ما ثَلاثَه

١٣ . (مُعَنْعَنٌ) كَعَن سَعيدٍ عَنْ كَرَمْ     (ومُبْهَمٌ) ما فيهِ راوٍ لَمْ يُسَمّ

١٤ . وكُلُّ ما قَلَّت رِجالُهُ (عَلا)     وضِدُّهُ ذاكَ الذي قَدْ (نَزَلا)

١٥ . وَما أضَفْتَهُ إلى الأصْحابِ مِنْ     قَوْلٍ وفِعْلٍ فهْوَ (مَوْقُوفٌ) زُكِنْ

١٦ (ومُرْسَلٌ) منهُ الصَّحابيُّ سَقَطْ     وقُلْ (غَريبٌ) ما رَوى راوٍ فَقَطْ

١٧ . وكُلُّ ما لَمْ يَتَّصِلْ بِحالِ     إسْنادُهُ (مُنْقَطِعُ) الأوْصالِ

١٨ (والمُعْضَلُ) السَّاقِطُ مِنْهُ اثْنانِ     وَما أتى (مُدَلَّساً) نَوعانِ

١٩ . الأوَّل الإسْقاطُ للشَّيخِ وأنْ     يَنْقُلَ مِمَّنْ فَوْقَهُ بعَنْ وأنْ

٢٠ والثَّانِ لا يُسْقِطُهُ لكنْ يَصِفْ     أوْصَافَهُ بما بهِ لا يَنْعَرِفْ

٢١.وما يُخالِفْ ثِقةٌ فيهِ المَلا     فـ(الشَّاذُّ) و(المَقْلوبُ) قِسْمانِ تَلا

٢٢ إبْدالُ راوٍ ما بِراوٍ قِسْمُ     وقَلْبُ إسْنادٍ لمتنٍ قِسْمُ

٢٣. و(الفَرْدُ) ما قَيَّدْتَهُ بِثِقَةِ     أوْ جَمْعٍ أوْ قَصرٍ على روايةِ

٢٤ . وما بِعِلَّةٍ غُموضٍ أوْ خَفَا     (مُعَلَّلٌ) عِنْدَهُمُ قَدْ عُرِفَا

٢٥ وذُو اخْتِلافِ سنَدٍ أوْ مَتْنِ     (مُضْطَرِبٌ) عِنْدَ أهْلِ الفَنّ

٢٦ . و(المُدْرَجاتُ) في الحديثِ ما أتَتْ     مِنْ بَعْضِ ألفاظِ الرُّواةِ اتَّصَلَتْ

٢٧ . وما رَوى كلُّ قَرينٍ عنْ أخِهْ     (مُدَبَّجٌ) فاعْرِفْهُ حَقًّا وانْتَخِهْ

٢٨ مُتَّفِقٌ لَفظاً وخطاً (مُتَّفِقْ)     وضِدُّهُ فيما ذَكَرْنا (المُفْتَرِقْ)

٢٩ . (مُؤْتَلِفٌ) مُتَّفِقُ الخطِّ فَقَطْ     وضِدُّهُ (مُخْتَلِفٌ) فاخْشَ الغَلَطْ

٣٠ . (والمُنْكَرُ) الفَرْدُ بهِ راوٍ غَدَا     تَعْدِيلُهُ لا يَحْمِلُ التَّفَرُّدا

٣١ . (مَتْرُوكُهُ) ما واحِدٌ بهِ انفَرَدْ     وأجْمَعُوا لِضَعْفِهِ فَهُوَ كَرَدّ

٣٢. والكَذِبُ المُخْتَلَقُ المَصْنُوعُ     على النَّبِيِّ فذَلِكَ (المَوْضُوعُ)

٣٣. وقَدْ أتَتْ كالجَوْهَرِ المَكْنُونِ     سَمَّيْتُها: مَنْظُومَةَ البَيْقُوني

٣٤. فَوقَ الثَّلاثِينَ بأرْبَعٍ أتَتْ     أقْسامُها ثُمَّ بخَيرٍ خُتِمَتْ

## شیکردنەوە بەیتەکان:

١. أبدأ بالحمد مصليا على محمد خير نبي أرسلا أبدأ بالحمد مصليا على محمد خير نبي أرسلا

دانەری مەنزومە رەحمەتی خوای لی بیت بە بسملە دەست پی دەکات لە بەر ئەوەی زانایان لە سەر ئەو رێبازە بوون کە پێویستە نامەکان بە (بسملە) دەست پێ بکات و خوتبەکانیش بە حمدلە ( واتە الحمد لله رب العالمین) و لە بەر ئەوەی کتێب و پەرتوکەکانیش دەچێتە خانەی نامەکان ئەوا دانەر بە (بسملە) دەستی پی دەکات هەرچەندە هەندێ لە گەورە زانایانی ئۆمەت وەك ئیمامی بوخاری هەندی جار بە (حمدلە) دەست پێ دەکەن. بەلگەی دەست پێ کردن بە بسملەش ئەو فەرمودەیە کە ئەبو هورەیرە رزای خوای لی بیت ریوایەت دەکات دە لیت : پیغەمبەری خوا صل الله علیە و سلم فەرمویەتی : (كُلُّ كَلَامٍ أَوْ أَمْرٍ ذِي بَالٍ لَا يُفْتَحُ بِذِكْرِ اللهِ فَهُوَ أَبْتَرُ - أَوْ قَالَ : أَقْطَعُ -) و ئەم فەرمودەیەش بە چەند دەربڕینی جیاواز هاتووە و زۆربەی زانایان لە سەر ئەو رایەن کە ئەم فەرمودە بە ریگا جیاوازەکانی لاوازە بەلام هەندی لە زانایان وەك ابن حجر و ئیمامی نووی رەحمەتی خوایان لێ بێت بە صحیح یان داناوە و ابن باز رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت دەچێتە خانەی حسن لغیرە واتە بە هۆی فەرمودەی تر کە هەمان واتا دەگەینێت بە هێز دەبێت و دەگاتە ڕادەی حسن .

هەرچەندە دەستپێك بە بسمەلە و حمدلە هەرکامیان بێت بەرەکەتی هەیە بەلام بە هێنانەوەی هەردوکیان بەرەکەتەکە کامل تر دەبێت.

دانەر دەلێت دەستپێکی مەنزومە بە سوپاس و ستایش بۆ خوای تعالی دەست پی دەکەم هەروەها بە صلاوات لیدان لە سەر محمد صل الله علیە و سلم کە باشترین نێردراوە کە رەوانە کرا بێت. هەر چەندە وەك ووتمان بە بسملەی دەست پی کردووە بەلام دەلیت بە حمدلەم دەست پیکردووە ئەوا دەچێتە خانەی گەراندنەوە بۆ لای خوا لە بەر ئەوەی بە ناوی خوای تعالی دەست پی بکرێت یا ستایش کردنی هەمووی هەر یەك شتە و صلاوات لیدانیش لە سەر پێغەمبەری خۆشەویست لە دوای حمدلە هەروەك خوشەویست صلی الله علیە و سلم فەرمانی پێکردوین کە سەرەتا ستایشی خوای تعالی بکریت ئینجا صلاوات لە سەر پیغەمبەرەکەی لی بدرێت، هەروەها دانەر دەلێت باشترین پیغەمبەر و رەوانە کراو هەرچەندە کە پیەغمبەری خۆشەویست صل الله علیە و سلم نهی کردووە لە چەندین فەرمودە کە پێش نەخرێت لە سەر پێغەمبەرانی تر سلاوی خوای تعالایان لی بێت ئەوەش زانایان چەند پاساوی بۆ دەهێننەوە: سەرەتا خوشەویستمان صل الله علیە وسلم دەفەرمویت: ( أنا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَومَ القِيامَةِ، وأَوَّلُ مَن يَنْشَقُّ عنْه القَبْرُ، وأَوَّلُ شافِعٍ وأَوَّلُ مُشَفَّعٍ) واتە من گەورەی نەوەی ئادەمم علیە السلام رۆژی کوتایی و یەکەم کەسم کە قەبرەکەم بۆ شەق دەبێت و یەکەم تکاکارم و رێگام پێدەدریت تکا بکەم. بەلام لە بەر خۆ بەگەورە نەزانینی فەرمانی کردووە کە لە سەر پیغەمبەرانی تر علیهم السلام پیش نەخریت، یا بۆ ئەوەی مشتومر و ناکوکی و ئاژاوە لە نیوان موسلمانان و ئەهلی کتاب دروست نەبیت لە

سەردەمی خۆی یا لەوانەیە ئەو کاتەی کە نهی کردووە لە پێشخستنی هێشتا نەیزانیوە و پێ ی نەگەیشتووە کە گەورە ی نەوەی ئادەمە علیه الصلات و السلام.

و سەلەوات لە لایەن الله جل جلاله برتیە لە رەحمەت و دەرخستنی پایە و فەزلی پیغەمبەری خۆشەویست و سەلەواتی مەلائیکەت بریتیە لە ستایشیان بەو شیوەی کە خوای تعالی مەدحی کردووە و سەلەواتی ئێمە دوعایە بۆ ئەوەی خوای تعالی پایە بەرزتری بکات.

## ٢- وَذِي مِن أَقْسامِ الْحَدِيثِ عِدَّه    وَكُلُّ واحِدٍ أَتَى وَحَدَّه

(و) واوی عەتفە ، و (ذي): مبتدأ ، اسم اشارەیە و (أقسام الحدیث ) خەبەرە واتە فەرمودە و لێرە مەبەستی زانستی دیرایەتە کە چەند جۆری هەیە مەبەستی ئەو ٣٢ جۆرە ی کە دانەری مەنزومە لێرە ناویانی هێناوە و یەك بە یەك باسیان دەکات.

جۆرەکانی فەرمودە زۆرن، هەندیکیان ناوەکەیان پەیوەندی بە سەنەدەکەوە هەیە و هەندێکیان بە دەقەکەی، بە لام بە گشتی لە ٣ جۆری سەرەکی ( صحیح، حسن، ضعیف) خۆیان دەبینەوە.

## ٣- أَوَّلُها (الصَّحِيحُ) وَهُوَ مَا اتَّصَلْ    إِسْنادُهُ وَلَمْ يَشِذَّ أَوْ يُعَلْ

### صحیح:

صەحیح لە زمانەوانی: پێچەوانەی سقیم ەو واتە نەخۆش واتە صحیح بە واتای تەندروست دێت لە زمان دا.

لە رووی زاراوە: بریتیە لەوەی کە فەرمودە گێرەوەیەکی ڕاست ( عدل) کە لە بەر کردنەکەی تەواوە ( تام الضبط) ە، بە سەنەدی نەپچراوە ( متصل السند) دەگێرێتەوە و بە بێ ئەوەی کێشە ( علة) ی هەبیت و پێچەوانەی گێڕانەوەی کەسێك کە لە خۆی دامەزراوترە ریوایەت نەکات ( غیر شاذ). بۆیە فەرمودەی صحیح ( راست) ٥ پێنج مەرجی هەیە کە دەبێ سیانیان تیادا هەبێت ( نەپچران، راستگۆیی، و لە بەر کردن) و دەبێ دوانی تریش تیایدا نەبێت ( ئەویش شذوذ و علة) یە.

### لە بەر گرنگی فەرمودەی صحیح بە درێژی شی دەکەینەوە:

١. مەرجی یەکەم ( العدل): بریتیە لە و کەسەی کە فەرمودە دەگێرێتەوە پێویستە لە خواترسان و پیاوەتی تیایدا هەبێت.
ئیمامی شافعی فەرمویەتی: ئەو کەسەیە کە واز لە گوناهە گەورەکان هێناوە و چاکەکانی زیاترە لە خراپەکانی.
خودی ( العداله) ش پینج مەرجی هەیە: ١.ئیسلام، ٢.بالغ بوون ( منالێك کە چاکە و خراپە لیك جیا دەکاتەوە واتە ممیز بیت بۆی هەیە فەرمودە وەربگریت بەلام تەنیا ئەو کاتە بۆی هەیە فەرمودە بگێریتەوە کە بالغ بوو بێت.

ئەوەش بە بەلگەی ئەو فەرمودەیە کە (محمو د ابن الربیع رەزای خوای لی بێت دەلێت: من لە پیغەمبەری خۆا ئەوەم بیرماوە کاتێك ئاوی دەمی لە دەفرێکەوە بە دەم و چاوی من دا کرد و من ئەو کات تەمەنم پینج سالان بوو)، ٣. عەقل و هۆش ٤. دوور بون لە گوناه و فیسق ٥. خۆ بە دوور گرتن لە و شتانەی کە پیاوەتی لەکدار دەکەن. پیاوەتی ( المرؤة): بریتیە لە هەندی داب و نەریتی کەسیتی کە وا دەکات مرۆڤ لە رەوشتی بەرز و نەریتە باشە کان، لا نەدات. ئەو شتانەش کە پیاوەتی لەك دار دەکەن وەك: ( باسی شت و بابەت گەلی سوك کردن، ئەنجام د انی کارێك کە لای خەلکی بە ناشرین سەیر دەکریت، پیسایی کردن لە ناو ئاوێی مەند و گۆم، باس کردنی خراپە و عەیبی خەلك کردن، وەستان لە بازارەکان بۆ سەیر کردنی ئافرەتان و هتد. تیبینی: ناپیاوەتی بە گشتی لە هەموو کات و شوینیك لە یەك دەچیت بەلام لە رووی هەندی بابەت لە سەردەمیك بۆ سەردەمیك و لە شوینیك بۆ شوینیك دەگۆریت بۆ نمونە بنیشت جون و سواری سەر پشتی ماین بوون.

مەبەستیش لە لە خواترسان: بریتیە لە خۆ بە دوور گرتن لە کارە خراپەکانی وەك هاوەل دانان بۆ خوا یا خود گوناه و بیدعە.

٢. مەرجی دووەم هەلگرتن ( الضبط) کە ئەمەیان دوو جۆرە: هەلگرتن بە هۆی لە بەر کردن ( ضبط الصدر)، و هەلگرتن بە هۆی نوسین ( ضبط الکتابة). و (ضبط التام) واتە هەلگرتنی بە تەواوەتی لێرە مەبەستی ئەوەیە لە و کەسە جیا بکرێتەوە کە لە هەلگرتنەکەی تۆزێك کەم و کورِی هەیە کە ئەمەیان مەرجی فەرمودەی ( حسن) ە.

٣. مەرجی سێیەم نەپچران ( الإتصال): ئەمەش واتای ئەوەیە کە سەنەدەکەی هێچی لێ نەفرتا بێت بە جۆریك هەر کەسێك لە مامۆستای خۆی بیستبیت.

٤. نەبوونی ( شذوذ): ووشەی ( شاز): لە رووی زمانەوانی واتە: لە ناو خەلکی جیاواز بی لە رووی گیرانەوە، بە لام لە رووی زاراوە: مەبەست لێی راویەکە کە خۆی جیگای متمانەیە بەلام پێچەوانەی کەسیکی تر کە لە خۆی جیگای متمانە تر بیت فەرمودە بگێرێتەوە.

٥. مەرجی پێنجەم ( معلل نەبوون): و ووشەی (معلل) لە زماندا: واتە ئەوەی کە خەوشێکی تێدا هەبێت، لە ڕووی زاراوەیی: بریتیە لە وەی کە خەوشێکی تێدا بێت بە هۆیەوە ڕخنە لە ڕاستیەکەی بگیرێت.

نمونەی فەرمودەی صحیح: وەك ئەوەی ئیمامی بوخاری رەحمەتی خوای لی بێت لە صحیح ەکەی هێنوەتەوە دەلێت: حدثنا عبدالله بن یوسف قال: أخبرنا مالك عن ابن شهاب عن محمد بن جبیر بن مطعم عن أبیه قال: سمعت رسول الله صل الله علیه و سلم قرأ في المغرب بالطور).

لەم فەرمودەیە هەموو راویەکان دامەزراو و راستگۆن و هەلگرتنیان تەواوە و پچران لە نیو سەنەدە کە نیە واتە هەموو ڕاویەکان ئەم فەرمودەیان لە مامۆستای خۆیان بیستووە و پێچەوانەی لە خۆیان متمانە پیکراوتر نەکردوە و هیچ جۆریکی خەوش و کیشە لە ناو سەنەد و دەقەکەی دا نیە.

بۆ زانینی دامەزراو بوون و هەلگرتنی فەرمودە بۆ هەر ڕاویەك دەبێت بگەڕێنەوە بۆ کتابەکانی رجال و جرح و تعدیل کە پێناسە و زانیاری وورد و حوکمی گەورە زانا ڕخنەگرەکانیان لە پلە و پایە ی ڕاویە کان تیدایە. لەم فەرمودەی سەرەوە و بەم شیوەیە هەر راویەك حوکمیان لە سەر دراوە:

١. عبدالله بن يوسف: دامەزراو و پسپۆرە ( ثقة متقن)
٢. مالك بن أنس: پیشەوا و حافیزە
٣. ابن شهاب الزهري: زانایەکی شارەزا لە فیقە و حافیزە و کۆدەنگی هەیە لە سەر شکۆ و پایەکەی و شارەزاییەکەی
٤. محمد ابن جبير: دامەزراوە
٥. جبير ابن مطعم: هاوەلیکی بەرێزە.

بۆ ئەوەی دلنیا بین لە نەبوونی ( شذوذ) دە بێت فەرمودەکە بە هەموو رێگاکانی ترەوە تەماشا بکەین تا بزانین ڕاوی لە گێرانەوەی فەرمودە پێچەوانەی کەسیکی لە خۆ متمانە پێکراوتری نەکردبێت، نەبوونی ( خەوش و عیلەت) یش زۆر کاریکی قورسە و کاری هەموو کەس نیە و شارەزایانی ڕخنەگری سەردەمەکانی پیشوو ئەم بەهرەیەیان هەبووە و توانیویانە ئەو خەوشە نهێنیانە ئاشکرا بکەن و لە کتێبەکانی ( العلل) باسیان لیوە کردوە. زانستی ( علل) یش یەکێکە لە زانستە گرنگە کان و یەکیك لە ناسراو ترین کتابە کانیش لەم بوارە کتابی ( علل للترمذي) یە هەروەها  شیکردنەوەی ابن رجب ی حنبلیش ناسراوترین شەرحی ئەم پەرتوکە بە نرخەیە.

## حوکمی فەرمودەی صحیح:

بە کۆ دەنگی زانایانی فەرمودە ناس دەبێت کاری پێ بکریت هەروەها ئەمە رای ئەو زانا ئۆصولی و شەرعزانانەیە کە قسەیان لێ وەردەگیرێت. بۆیە بەلگەیەکی سەرەکی شەریعەتە و نابێت موسلمان وازی لی بهێنێت و پاش گوێ ی بخات.

## یەکەم کتێب لە سەر فەرمودە صحیحە کان:

یەکەمیان صحیح ی ئیمامی بوخاری بوو، ئێنجا صحیح ەکەی ئیمامی موسلیم رەحمەتی خوا لە هەردوکیان بیت.  بەلام زۆربەی زانایان لە سەر ئەو رایەن کە ئەم دوو پەرتووکە هەموو فەرمودە صحیحەکانیان لە خۆ نەگرتووە بەلکو ئەم دوو گەورە ئیمامە تەنیا ئەو فەرمودە صحیحانەیان لە کتابەکانیان کۆ کردۆتەوە کە بە پێ ی مەرجەکانی ئەوانن. مەرجەکانی ئیمامی بوخاریش توندترە لە هی ئیمامی موسلیم لە بەر ئەوەی لای ئیمامی بوخاری دەبی هەر راویەك بێجگە لە وەی کە خەلکی یەك سەردەم بن دەبێت بە یەکیش گەیشتبن و فەرمودەیان لە یەکتر وەرگرتبێت.

ئیمامی بوخاری ئەفەرمویت: ئەوەی لە فەرمودەی صحیح نەم هێناوەتەوە زیاترن لەوەی کە هێناومەتەوە.

ئیمامی موسلیم دەفەرمویت: مەرج نیە هەر فەرمودەیەك صحیح بێت لای من ئا لیرە ( واتە لە صحیحەکەی موسلیم) هینا بێتەوە بەلکو تەنیا ئەوانەی کە کۆدەنگ بوون لە سەری ئەوانەم هیناوەتەوە.

ژمارەی فەرمودە صحیحەکانی ئەم دوو ئیمامە:

بوخاری: بە گشتی ٧,٢٧٥ فەرمودە بە دووبارەشەوە، و بە بێ دووبارە ٤,٠٠٠ فەرمودە

موسلیم: بە گشتی ١٢,٠٠٠ فەرموودە بە دووبارەشەوە و بە بێ دووبارە نزیکەی ٤,٠٠٠ فەرمودە

باقی فەرمودە صحیحەکان لە کتیبە بە ناوبانگەکانی وەك: صحیح ی ابن خوزێمە، صحیح ی ابن حبان، مستدرك ی حاكم، سونەنی أربعە و سنن ی دارە قوتنی و هتد. دەدوزرێنەوە. بەلام ئەمانەش مەرج نیە هەمویان صحیح بن بەلكو دەبێت بە راشكاوی جەخت لە صحیح بونەكەیان كرا بیت.

## جیاوازی فەرمودە صحیحەکان لە رووی پلەوە:

فەرموودە صەحیحە كان لە یەك ئاست و پلە نین بەلكو هەندێكیان صحیح ترن لە وانەی تر، لە بەر پلەی ڕاویەكانیان، بۆ نموونە هەندێ فەرمودە هەموو راویەكان ئیمامی بەناوبانگ بوون یا بێجگە لە فەرمودە گێرانەوە لە فیقە و شەرعیش شارەزا بوون ئەمە وا دەكات فەرمودەكان پلەیان جیاوا زبێت ئەمەش بە كەلك دێت كاتێك دوو فەرمودە بە ڕوالەت جیاوازیان هەبێت و لە پێناو هەلبژاردن لە نێوانیان واتە (ترجیح) پێویستیمان بە زانینی ئەم راستیە دەبێت.

هەروەها ئەو فەرمودانەی كە هەردوو شیخ واتە ( بوخاری و موسلیم) لە صەحیحەكانیان هاتووە پلەیان بالا ترە لەوەی كە تەنیا یەكێكیان هێناویانەتەوە و ئەوانەی لای بوخاری بە تەنیا ریوایەتی كردوون بە هیزترن لە وانەی تەنیا موسلیم ریوایەتی كردون ئینجا ئەوانەی بە پێ ی مەرجەكانیانە بە لام نەیانگێراوەتەوە، ئێنجا ئەوانەی لە سەر مەرجی بوخارین، ئینجا ئەوانەی بە پێ ی مەرجەكانی موسلیم ن، ئێنجا فەرمودەكانی تر كە لای زانای تر صەحیح ن وەك ابن خوزێمە و ابن حبان.

**مانای واژەی ( متفق علیە):** واتە هەردوو ئیمام بوخاری و موسلیم لە سەر ی كۆدەنگن نەك ئەوەی هەموو زانایانی تری ئۆمەت لە سەری كۆدەنگن.

## ٤ـ يَرْوِيهِ عَدْلٌ ضَابِطٌ عَنْ مِثْلهِ مُعْتَمَدٌ في ضَبْطِهِ وَنَقْلِه

واتە ئەو كەسەی كە وەصف كرایە بە عدل واتە جێگای متمانە یە، لە ڕووی دین و هەلگرتنی فەرمودە لە كەسیكی هاوپلەی خۆی لە رووی عەدالەت و هەلگرتن ریوایەت بكات بە پشت بە ستن بە لە بەر كردن یا پەرتوكەكەی و خۆی بگێریتەوە.

سەبارەت بە چۆنیەتی زانینی عەدالەتی ڕاویەكان و هەلگرتنیان زانستێك هەیە بە ناوی (الجرح و التعدیل) واتە لەكدار كردن و متمانە پێكردن كە كۆمەلێك زانای ڕخنە گر و پسپۆر كتابیان لە سەر داناوە و دابەش دەبن بۆ ٣ ئاست: هەندێكیان بە ئاسانی خەلك بە متمانە پێكراو دادەنێن: وەك تورمزی و حاكیم و بەیهەقی و هەندێكیشیان مەرجەكانیان توند و تولە وەك: ابن مەعین و ابو حاتم و جەوزەجانی و هەندێكی تریش میان ڕەون وەك: ئیمامی ئەحمەد و بوخاری ڕەحمەتی خوا لە هەر هەموویان بێت. گەر هەمویان كۆك بوون لە سەر متمانە پێكردن یا لەكدار كردن ئەوە جیگای گومان نابێتەوە و بەلام كاتی هەبوونی ناكوكی زیاتر پشت بە ڕای میانرەوەكان دەبەسترێت. ئەم كارەش واتە حوكم دان لە سەر ڕاویەكان كارێكی ئاسان نیە و پێویستە ئەو كەسەی ئەو كارە دەكات بنچینە و بنەماكانی زانستی جرح و تعدیل بزانێت و بێ لایەنانە پشت ببەستێتە سەرچاوە باوەڕ پێكراوەكانی زانستی رجال و جرح و تعدیل.

یەكەمین كەسانێك كە قسەیان لە بارەی جرح و تعدیل كردبێت: ابن سیرین (كە تابعی بووە) و ئیمامی شوعبی بوون رەحمەتی خوایا لی بیت. و ناسراوترین كتابەكانی ئەم زانستە واتە علم الرجال و الجرح و التعدیل: تهذیب الكمال ی ئیمامی مزی و كورت كراوەكانی وەك ( تقریب التهذیب ی ابن حجر عسقلانی) و ( التهذیب) و تذهیب التهذیب) ی ئیمامی زەهەبی یە و ثقات ی ابن حبان و الضعفاء ی ابن عدی یە.

كاتێك كە دانەر دەلێت پشت بە لە بەر كردن یا پەرتوكی خۆی و گێرانەوەی خۆی دەبەستێت ئەمەش ئاماژەیە بە پلەكانی هەلگرتنی فەرمودە و گێڕانەوەیان: كە بە هێزترینیان ١.بیستنە لە دەمی شیخ، ئێنجا ٢. بە سەر شێخ دا بخوێنریتەوە واتە كەسیك فەرمودە بخوێنیتەوە و شێخەكە لە وێ بێت ٣. مۆلەت دان بە ریوایەت كردن ٤. مناولە واتە دەستاودەست كردن بە واتای وەرگرتنی پەرتوكی فەرمودەكان لە شێخێك ئەویش دوو جۆرە بە مۆلەت یا بە بێ مۆلەت ٥. مكاتبە، واتە شیخ بە نامە ئەو فەرمودانەی كە دەیگێرێتەوە بنێرێت بۆ كەسیك ئەمەش دوو جۆرە بە مۆلەت یا بی مۆلەت.

٦، اعلام و اتە ڕاگەیاندن كاتێك قوتابی رادەگەیێنێت ئەم فەرمودەی بیستووە هەرچەندە مۆلەتی نەبێت ٧. وەسیەت: كاتێك شێخێك وەسیەت بكات كەسێك فەرمودەكانی لێ بگێرێتەوە ٨. وجادە: كاتێك كەسێك پەرتوكی فەرمودەكانی شێخێك دەدۆزیتەوە بەلام خۆی لێ ی نەبیستووە و مۆلەتیشی نیە و ئەمەیان بڕوا پیكراو نیە و بە پچڕاو دادەنرێت.

### ٥- والحسن المعروف طرقا وغدت رجاله لا كالصحيح اشتهرت

## فەرمودەی حسن:

لە رووی زمانەوانی واتە: جوان، لە ڕووی زاراوەیی: واتە هەمان پێناسەی فەرمودەی صحیحی هەیە بە جیاوازی یەك مەرج نەبێت ئەویش لە ڕووی هەلكرتن لە جیاتی ئەوەی كامل و تەواو بێت ئەوا لە بەر كردنەكەی و هەلگرتنی لاواز و ناتەواو بێت، بە واتای ئەوەی یەكێك لە ڕاویە كان یا زیاتر لە ڕووی لە بەر كردنەوە و گێرانەوەی توزێك لاوازبیت.ئەمەش وا دەكات پلەی فەرمودە لە صحیح بۆ حسن دابەزێت.

پێناسەی هەندێك لە زانایان بۆ فەۆمودەی حسن [١]

تورمزی: هەر فەرمودەیەك كە لە ناو سەنەدەكەی دا كەسێك نەبێت كە بە درۆ تۆمەتباركرابێت و هەروەها فەرمودەكە شاز نەبێت و لە ڕێگای تر گێردرابێتەوە لای ئێمە فەرمودەیەكی حسن ە.[٢]

---

[١] تیسیر مصطلح الحدیث، محمود الطحان ص. ٤٦

٢ نفس المصدر

ابن حجر: هەوالی ئاحاد کە لە لایەن کەسی عدل واتە راستگۆ بگێڕدرێتەوە کە هەلگرتنەکەی تەواو بێت و سەنەدەکەی نەپچڕاو بێت و گیر و گرفت و علە ی تیادا نەبێت و شاز نەبێت ئەوە فەرمودەکە خۆی لە خۆیدا صەحیحە، بەلام گەر هەلگرتنەکەی نوقصانی و کەم و کوری تێدا بوو ئەوا حسن ە.[٣]

## حوکمی فەرمودەی حسن:

وەك فەرمودەی صحیح وایە لە کار پێکردن بەلام لە هێزەوە لەو خوارترە بۆیە هەموو زانایان کاری پێ دەکەن، چ زانایانی فەرمودە و چ ئۆصولیەکان، تەنیا هەندێ کەسی دەگمەن نەبێت. .هەندێ لە وانەش کە ئاسانکارن بە صەحیح یان ئەژمار کردووە وەك ابن حبان و ابن خوزیمە. [٤]

هەندێکیش بەو فەرمودانەی لە رووی پلەیەوە دکەونە نیوان صحیح و لاواز دەلین حسن.

**هەروەها فەرمودەی حسن دوو جۆرە:** حسن لذاتە و حسن لغیرە. حسن لذاتە واتە خۆی لە خۆیدا حەسەنە و مەرجەکانی حەسەنی تێدایە بەلام حسن لغیرە واتە خۆی لاوازە بەلام لاوازیەکەی گەورە نیە و فەرمودەی تری لاواز پالپشتی دەکەن و پلەی بەرزی دەکەنەوە بۆ حسن لغیرە.

بەلام ابو عمرو ابن صلاح ی شارەزووری رەحمەتی خوای لی بێت دەلێت: مەرج نیە گەر فەرمودەیەك بە چەند رێگای جیاواز هاتبێت وەك فەرمودەی ( الأذنان من الرأس) ببێتە حەسەن لە بەر ئەوەی لاواز بوون پلەی جیاوازی هەیە، هەندێکیان بە رێگای تر لاوازیەکە لا ناچێت وەك ریوایەتی کەسی درۆ زن و مەتروك..[٥]

**فەرمودەی حەسەن لە کوێ هەیە:**

ابن صلاح شارەزوری دەفەرموێت: ئیمامی تورمزی بنچینەیە بۆ زانینی فەرمودەی حەسەن ( واتە کتابەکەی).

هەروەها سنن ی أبو داود فەرمودەی حسن ی زۆر تێدا هەیە کاتیك لە فەرمودەیەك بی دەنگ دەبێت ئەوا حسن ە.

## فەرمودەی حسن صحیح:

ئەمە زاراوەیەکە تایبەتە بە ئیمامی تورمزی رەحمەتی خوای لێ بێت. ئەمەش زانایان ڕاڤەی جیاوازیان بۆ کردووە، هەندێ دەلێن دوو سەنەدی هەیە یەکێك صەحیح و ئەوی تریان لاواز، هەندێکی تر دەلێن حەسەن لە ڕووی دەقەوە و صەحیح لە رووی

---

٣نفس المصدر

٤ نفس المصدر

٥ الباعث الحثيث لابن كثير، ص ٢٥

سەنەدەوە . ابن كثير لە كتابي (الباعث الحثيث) دەڵێت پایەیەکی سەربەخۆیە لە نێوان صەحیح و حەسەن لە حەسەن بالاتر و لە صحیح بەرەو ژێر ترە [٦]

## نمونەی فەرمودەی حسن:

روي الإمام أحمد بن حنبل في مسنده و قال: حدثنا يونس و أبو سلمة الخزاعي قالا: حدثنا ليث، عن يزيد- يعني ابن الهاد- عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده، أنه سمع النبي صل الله عليه و سلم يقول: (( ألا أخبركم بأحبكم إلي و أقربكم مني مجلسا يوم القيامة؟)) ، فسكت القوم، فأعادها مرتين أو ثلاثا، قالوا: ( نعم يا رسول الله صل الله عليه و سلم)، قال: (( أحسنكم أخلاقا)).

**لێکدانەوەی پلەی ڕاویەکانی ئەم فەرمودە یە:**

١. يونس: يونس بن يزيد الأيلي: متمانە پێکراوە.
٢. أبو سلمه: منصور بن سلمه الخزاعی: متمانە پێکراو دامەزراو و حافظ ە.
٣. ليث: ليث بن سعد الفهمی المصری: متمانە پێکراو دامەزراو شارەزایە لە فیقە و پێشەوایەکی بە ناوبانگە.
٤. يزيد: يزيد بن عبدالله بن أسامه بن الهاد الليثي: متمانە پێکراوە و فەرمودەی زۆر گێراوەتەوە.
٥. عمرو ابن شعیب: عمرو ابن شعیب بن محمد بن عبدالله بن عمرو ابن العاص: صدوق واتە راستگۆیە ( ئەمەش واتە لە ڕیزی پیاوەکانی فەرمودەی حەسەنە) .

هەموو ڕاویەکانی ئەم سەنەدە متمانە پێکراون جگە لە عمرو ابن شعیب کە پلەی لە خوارترە و ئەم واژەیە واتە صدوق مانای ئەوەی کە لە هەڵگرتنی کەم و کوریەکی کەم هەیە بۆیە پلەی ئەم فەرمودە دادەبەزێت بۆ حەسەن. [٧]

**٦- وكل ما عن رتبة الحسن قصر فهو الضعيف وهو أقسام كثر**

## ضعيف

فەرمودەی لاواز بریتیە لە هەر فەرمودەیەك كە صەحیح و حەسەن نەبێت و مەرجەکانیان تیایدا بە دی نەکرێت.

لێرەدا دانەری مەنزومە رەحمەتی خوای لێ بێت بە گشتی فەرمودەی بۆ (٣) جۆری صەحیح و حەسەن و لاواز دابەش کردووە، بەلام لە راستیدا دەتوانین بلێین (٥) بەشە:

١. فەرمودەی صحیح لذاته ( واتە خۆی لە خۆیدا صحیح) ە
٢. فەرموده صحیح لغیره ( واتە بە هۆی هەبوونی ڕێگای تر بە هیز بووە و گەیشتۆتە پلەی صەحیح)

---

[٦] نفس المصدر
[٧] الميسر في علم مصطلح الحديث للماجد الغوری، ص: ١٣٢-١٣٣

٣. فەرمودەی حسن لذاتە: واتە خۆی لە خۆی حەسەنە و مەرجەکانی حەسەنی تێدابووە

٤. فەرمودەی حسن لغیرە: بە هۆی هیزی فەرمودەی تر و پالپشتی بە هێز بووە و گەیشتۆتە پلەی حەسەن

٥. فەرمودەی لاواز

**مانای بەیتەکە:** هەر چی فەرمودەی تر کە لە پایەی حەسەن دابەزێت بە لاواز دادەنرێت و ئەمەشیان زۆر جۆری هەیە.

**حوکمی کار پێکردن بە فەرمودەی لاواز:** لێرە ناکوکی هەیە لە نێو زانایان هەندێکیان بە گشتی کار کردن بە فەرمودەی لاواز رەت دەکەنەوە وەك ئیمامی بوخاری رەحمەتی خوای لێ بێت، هەندێکیش بە هەموو جۆریك فەرمودەی لاواز وەردەگرن و کاری پێ دەکەن و هەندێ زانای تریش بە هەندێ مەرج رێگەیان داوە بە، بەکارهێنانی فەرمودەی لاواز تەنیا لە بابەتی ئامۆژگاری و هان دان بۆ کارە چاکە کان: وەك ئیمامی ئەحمەد رەحمەتی خوای لێ بێت، مەرجەکانیش ئەمانەن:

١. فەرمودە کە پەیوەندی بە بواری الترغیب و الترهیب ەوە هەبێت واتە بۆ ئامۆژگاری و وەعز و ئیرشاد بە کار بێت و لەم بازنەیە ەرنەچێت.

٢. لاوازیەکەی زۆر گەورە نەبێت و نەچێتە خانەی ( موضوع و المنكر) واتە هەلبەستراوەکان

٣. ئەم فەرمودەیە بنچینەیەکی ڕاست و جێگیری هەبیت لە قورئان و سونەت بۆ نمونە ئەو فەرمودانەی کە هانی خوێندنەوەی قورئان دەدەن.

٤. ئەو کەسە بڕوای وانەبێت کە پێغەمبەری خۆشەویست صل الله علیه و سلم وای فەرمووە و هەروەها دەبێت هۆکاری لاوازی لە فەرمودەکەش ئاماژەی پێ بدرێت.

## ٧- وما أضيف للنبي المرفوع وما لتابع هو المقطوع

### مرفوع

واتە هەر فەرمودەیەك سەنەدەکەی بگاتەوە پێغەمبەری خۆشەویست صل الله علیه و سلم پێ ی دەوترێت مرفوع.

مرفوع لە زمانەوانی: واتە بەرزکراوە، وە لە رووی زاراوەیی: هەر فەرمودەیەك کە بدرێتە پاڵ رسول الله صل الله علیه و سلم لە قسە و کردەوە و تقریر و ئاکار بە مرفوع دادەنرێت ئێنجا سەنەدەکەی کەی نەپچڕاو بێت یا پچڕانی تێدا بێت وەك ئەوەی مورسەل بیت واتە غەیری هاوەلان لە پیغەمبەرمان صل الله علیه و سلم ریوایەت بکەن.

مەبەستیش لە دانانی ئەو ووشەیە بۆ پێگە و پایە ی ئەو کەسەیە کە فەرمودەی پێ دەگات ئەویش خۆشەویستمانە صل الله علیه و سلم.[٨]

٨ المیسر في مصطلح الحدیث للغوری، لاثەرە ١٥١

## جۆرەكانی مرفوع:

١. مرفوع ی قولی: وەك گۆتەی هاوەڵان رەزای خوایان لی بیت یا غەیری ئەوان: ( قال رسول الله صل الله عليه و سلم كذا...)

٢. مرفوع ی فعلی: وەك گۆتەی هاوەلان رەزای خوایان لی بیت یا غەیری ئەوان: ( فعل رسول الله صل الله عليه و سلم كذا...)

٣. مرفوع ی تقریری: وەك گۆتەی هاوەلان رەزای خوایان لی بیت یا غەیری ئەوان: ( فعل بحضرة النبی صل الله علیه و سلم كذا... و لا يروى إنكاره – عليه الصلاه و السلام – لذلك الفعل)

٤. مرفوع ی وصفی: وەك گۆتەی هاوەلان رەزای خوایان لی بیت یا غەیری ئەوان: ( كان رسول الله صل الله عليه و سلم أحسن الناس خلقا).

## حوكمی فەرموجەی مرفوع:

دەكرێت فەرمودەیەكی مرفوع صەحیح بێت یا حەسەن بێت یا لاواز بیت بە پێ ی هەبوون یا نەبوونی ٥ مەرجەكە.

## فەرمودەی مقطوع:

لە رووی زمانەوانی واتە پچراو و لە زاراوە دا واتە: ئەو فەرمودەی كە لە ڕووی قسە و كردار دەدرێتە پاڵ تابعینەوە.

تابعی: بریتیە لەو كەسەی كە بە هاوەلێك یا زیاتر گەیشتووە ، بەلام پێغەمبەریان صل الله علیه و سلم نەبینیوە. و ابن صلاح دەفەرموێت بە ڕەهایی تابعی واتە ئەوەی بە ئیحسانەوە شوین كەوتووە. بۆیە ئەوانەی كە هاوەلانیان بینی بیت بەلام لە سەر ڕێچكە و بیر و باوەڕی ئەوان نەبووبن بە تابعی دانانرین وەك (معبد الجهنی) قەدەرەی كە موبتەدیع بووە.[9]

هۆكاری ئەو ناوەش ئەوەیە، كە قسە یا كردارەكە لە لای تابعین دەپچرێت و لە وانەوە تێناپەرێت.

## جۆرەكانی مقطوع:

١. مقطوع ی قولی: وەك قسەی ئیمام حسن ی بصری رەحمەتی خوای لێ بێت دەربارەی نوێژ كردن لە دوای موبتەدیع ( نویژەكەت بكە و بیدعەكەش لە سەر خۆی).

٢.مقطوع ی فیعلی: وەك قسەی ابراهیم بن محمد بن المنتشر: ( كان مسروق يرخى الستر بينه و بين أهله، و يقبل على صلاته، و يخليهم و دنياهم). مسروق تابعینە. واتە: مەسروق پەردەی لە نیوان و خۆی و ماڵ و منالی بەر ئەدایەوە و ڕووی لە نوێژەكەی دەكرد و ماڵ و منالەكانی لە گەل دونیاكەیان بە جێ دەهێشت.

## حوكمی فەرمودەی مقطوع:

ئەم جۆرە فەرمودەیە لە هیچ شتێك لە حوكمە شەرعیەكان دا كاری پێ ناكرێت تەنانەت گەر ئەم ووتە یا كردارە كە دراوەتە پاڵ خاوەنەكەی راستیش بێت، لە بەر ئەوەی ئەمە قسە و كردەوەی یەكێكە لە موسلمانەكان. بەلام گەر قەرینەیەك هەبوو

[9] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٢٨

کە رفع بوونەکەی بسەلمێنیت وەك قسەی هەندێ لە ڕاویەکان کاتی ناوهێنانی تابعی دەلین ( یرفعه) ئەوا لێرە دا حوکمی فەرمودەی مەرفوعی مورسەل وەردەگرێت واتە بەرزی دەکاتە وە بۆ لای پێغەمبەرمان صل الله علیه و سلم، بەلام ناوی هاوەلە کە نەهاتووە.

٨- والمسند المتصل الإسناد من راويه حتى المصطفى ولم يبن

## مسند

مسند: بە فەتحی سین واتە ئەو سەنەدەی کە نەپچڕاوە، لە ڕاویەکە وتا دەگاتە پێغەمبەری خۆشەویست صل الله علیه و سلم.

**و لم يبن ( لە ناو بەیتەکە):** واتە سەنەدەکە نەپچراوە، و ئەمەش مانای وانیە کە هەر فەرمودەیەکی مسند صەحیح بێت تەنیا لە بەر ئەوەی سەنەدەکەی نەپچڕاوە، لە ڕاویەکەی تا پێغەمبەرمان صل الله علیه و ، لە بەر ئەوەی لەوانەیە هەندێ لە ڕاویەکان لاواز یا نەناسراو بن بۆیە هەر فەرمودەیەکەی ەصحیح، مسند نیە و هەر فەرمودەیەکی مسند مەرج نیە صەحیح بێت وەك فەرمودەی مەوقوف کە صەحیح بێت ناگاتە پێغەمبەرمان صل الله علیه و سلم، و لە لای هاوەلان سەنەدەکە ڕادەوستیت، بەلام لە گەل ئەوەش صەحیحە چونکە ڕاویەکان هەمویان عدل و جیگای متمانەن.[١٠]

٩- وما بسمع كل راو يتصل إسناده للمصطفى فالمتصل

## متصل

لیرە دا متصل بە پێ ی مەبەستی دانەری ئەم مەنزومەیە، بریتیە لە مەرفوع کاتێك هەر ڕاویەك بە شێوازی سەماع واتە بیستن لە سەروی خۆی وەرگرتووە تا پێغەمبەرمان صل الله علیه و سلم.[١١]

لە بەیتی ٨ و دا، ٩ مەبەستی ئیمامی بەیقونی رەحمەتی خواى لێ بێت، بەردەوامی شیکردنەوەی فەرمودەی مەرفوعە لە بەیتی ٧ و جیا کردنەوەی لە فەرمودەی مقطوع.

١٠ مختصر شرح منظومة البيقونية، محمد حسن نورالدين اسماعيل ص: ١٥

١١ بروانە سەرچاوەی پیشوو

| | |
|---|---|
| ١٠- مسلسل قل ما على وصف أتي | مثل أما والله أنبانـي الفتى |
| ١١- كذاك قد حدثنيه قائما | أو بعد أن حدثني تبسما |

## مسلسل

فەرمودەی مسلسل: بریتیە لەو فەرمودەی کە هەر ڕاویەك بە شێوەیەك ، یا لە حالەتێکی دیاریکراو وەریگرتووە و بە هەمان ئەم شێوە و حالەتەش وەك خۆی بۆ ڕاوی تر ریوایەت دەکەن. لە م بەیتە باس لە وەصف دەکات وەك ئەوەی سوێند بخوات بلی (والله) پیاوەکە ئاوهای پێ ڕاگەیاندین. یا بە وەستانەوە لە سەر پێ فەرمودەی بۆ گیرامەوە یا دوای ئەوەی بۆی گێڕامەوە زەردەخەنەیەکی کرد. لە بە ناوبانگ ترین فەرمودەکانی مسلسل کە لە نێو زۆربەی هەرە زۆری مەجالسی ریوایەت بەو فەرمودەیە دەست پی دەکات فەرمودەی ( المسلسل بالأولية) یە ( الراحمون يرحمهم الرحمن، إرحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء) و حديث (المسلسل بالمحبة) یە کە معاذ دەگێرێتەوە ( إني أحبك في الله...).

| | |
|---|---|
| ١٢- عزيز مروي اثنين أو ثلاثة | مشهور مروي فوق ما ثلاثة |

## عزيز

دانەری مەنزومە ، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لەم بەیتە دا باس لە دوو جۆرە فەرمودە دەکات، ئەویش عزیز و مەشهورە، کە لەم مەنزومەیە دەکاتە جۆری نۆیەم و دەیەم، لە و سی و دوو جۆر فەرمودەی کە تیایدا باس کراوە.

**عزیز**: لە زمانەوانی: لە (عز) هاتووە واتە سەربەرزی، بەلام لە زاراوە: بریتیە لەو فەرمودەی کە دوو ڕاوی لە دوو کەسی تر یا سێ کەس ئەوانیش لە دوو کەسی تریا سێ کەس فەرمودەکە بگێرنەوە هەتا دەگاتە کۆتایی سەنەدەکەی. لێرەدا، دانەر بە مەرجی دانەناوە کە مەرفوع بێت بەلکو دەکرێت ئەم جۆرە مەرفوع یا مەوقوف بێت.[١٢]

بۆئەمە مەبەستەش، بە عزیز ناو نراوە لە بەر ئەوەی دوو ڕاوی یا سێ کەس، لە هەر توێژێك ڕیوایەت دەکەن، ڕیوایەتەکە بە هێز دەکەن، و چەندی ژمارەی ڕاویەکان لە هەر توێژێك زیاتر بیت، ئەوەندە سەنەدی فەرمودەکە ی پێ بە هێز دەبێت.

## مشهور

ومشهور: لە زمانەوانی: واتە بە ناوبانگ، و لە زاراوە: بریتیە لەو فەرمودەی کە زیاتر لە سێ ڕاوی لە هەر تەبەقەیەك فەرمودەیەك بگێرنەوە.

---

١٢ شرح المنظومة البيقونية لابن عثيمين، ص.٦٧

**تیبینی:** بەلام مشهورێکی تریش ، ئەویش فەرمودەیەکە کە لە ناو خەلکی یا لە نیو زانایان بەناوبانگە، بە بیّ تەماشاکردنی سەنەدەکەی کە ئەمە جۆریکی فەرمودە نیە، بەلکو هەر فەرمودەیەك کە لە ناو خەلکی یا زانایانی شەرعزان بە ناوبانگ بێت، بە هۆی ناوبانگەکەی پیّ ی دەلین مشهور، وەك فەرمودەی ( لا يقاد الوالد بولده) واتە باوك گەر منالەکەی بکوژێت بە قیساس ناکوژرێتەوە. هەندیّ لە زانایانی بواری فیقە، کار بەم جورە فەرمودە بەناوبانگانە دەکەن تەنانەت گەر سەنەدیشیان نەبیت.[13]

بەلام هەروەك ووتمان مەبەست لە فەرمودەی مەشهور، لە زانستی فەرمودە ناسی ئەو فەرمودەیە کە لە سەنەدەکەی لە هەر تەبەقەیەك زیاتر لە سیّ کەس فەرمودەکە ڕیوایەت بکەن.

مەرجیش نیە، هەر فەرمودەیەکی عزیز یا مشهور صەحیح بێت، بەلکو چەندە ڕاویەکان زۆریش بن تەنیا تەماشای عەدالەت و متمانە پێکرانیان دەکرێت، گەر لاواز بوون سەنەدی فەرمودەکەش پیّ لاواز دەبێت.

**١٣- معنعن كعن سعيد عن كرم ومبهم ما فيه راو لم يسم**

## معنعن و مؤنن

**فەرمودەی معنعن:** واتە بە بەکارهینانی دەستە واژەی (عن) دەگێردرێتەوە. وەك ئەوەی ڕاوی بلێت: عن نافع عن ابن عمر ... یا خود بلێت: (حدثني فلان عن فلان). وەك لە بەیتەکە هاتووە سعید لە کەرەم بگێرێتەوە بە بەکارهینانی ووشەی (عن)، و جۆریکی تریش هەیە کە بە فەرمودەی ( مؤنن) بە ناوبانگە واتە لە جیاتی (عن) ووشەی (أن) بە کاربهێنرێت بۆ دەربرینی وەرگرتنی فەرمودەکە لە مامۆستاکەی. کە ئەم دوو جۆرە لە حوکم وەك یەك وان. لە ڕاستیدا ووشەی ( عن) پیّ ی دەوتریت صیغەی تمريض واتە دەرربڕینی نەخۆش، واتە دەربڕی لاوازی وەرگتنی فەرمودە یە، واتە لە وانەیە ڕاویەکە فەرمودەی لە مامۆستاکەی بیستبیت یا خود نەی بیستبێت.

## حوکمی معنعن و مۆنن

حوکمی ئەو جۆرە گێڕانەوەیە ئەوەیە، کە بە سەماع واتە بیستن لە قەلەم دەدرێت، جگە لە و حالەتەی کە ڕاویەکە بە تەدلیس بە ناوبانگ بێت. تەدلیس یش چەند جۆری هەیە و هەریەکە و پێناسەی خۆی هەیە بەلام بە کورتی و بە گشتی تەدلیس، واتە شاردنەوەی هۆکاریك لە ڕیوایەت کردنەکە . تەدلیسیش دواتر باسی لێوە دەکرێت. بۆیە فەرمودەی (معنعن) لە کەسێك کە بە تەدلیس بە ناوبانگ نەبێت وەردەگیرێت و بە سەماع لەقەلەم دەدرێت. بەلام بۆ دلنیایی و پاراستنی فەرمودەکانی پێغەمبەرمان صل الله عليه و سلم، کەسێك کە بە تەدلیس بە ناوبانگە و بە (عنعنه) ڕیوایەت دەکات ڕیوایەتەکەی وە لا دەنرێت لە بەر

---

[13] شرح محمد حسن إسماعيل. ص ١٦

ئەوەی لە وانەیە ئەو (عن) ە بۆیە بە کارهێنرابێت کە لاوازی ڕاویەکی تر بشارێتەوە. ئەمەش یەکێکە لەو ڕێکارانەی فەرمودەناسان بۆ پاراستنی سونەتی پێغەمبەرمان صل الله علیه و سلم گرتویانەتە بەر.

## مبهم

**فەرمودەی مبهم**: وەك لە بەیتەکە دا هاتووە ئەو فەرمودەیە کە ڕاویەك لە ناو سەنەدەکە باسی لێوە کراوە، بە بێ ئەوەی ناوی بهێنرێت. وەك فەرمودەی ئەنەس – ڕەزای خوای لی بیت- ووتی: ئەعرابیەك لە ڕۆژی هەینی لە کاتی ووتار خوێندنەوەی پیغەمبەر صل الله علیه و سلم هاتە ژوور... لێرە ناوی کەسەکە دیار نیە.

## حوکمی فەرمودەی مبهم:

ئەم فەرموەیە وەرناگیرێت هەتاوەکو ئەو نادیاریە ڕوون نەبێتەوە، لە بەر نەزانینی حالی ئەو کەسە ئاخۆ متمانە پێکراو و دامەزراوە لە گێرانەوە یا نە. بەلام گەر نادیارەکە وەك لە نموونەی پێشوو صەحابی بوو ئەوا کێشە نیە لە بەر ئەوەی هەموو هاوەلان ڕەزای خوایان لێ بێت ڕاستگۆ و جێگای متمانەن بە شایەتی خوای تعالی لە قورئان: ( وکلا وعد الله الحسنى و الله بما تعملون خبیر) الحدید .١٠.[١٤]

| |
|---|
| ١٤- وكل ما قلت رجاله علا وضده ذاك الذي قد نزلا |

## ئیسنادی عالی و نازل

لەم بەیتە دانەر ڕەحمەتی خوای لی بیت، باسی (اسناد العالی و النازل)، دەکات واتە ئیسنادی بالا و نزم. مەبەستیش لە ئیسنادی بالا ئەوە یە ئیسنادەکە لە ڕووی ژمارە وە، کەمترین ژمارەی ڕاوی تێدایە، هەرچەندە ژمارەی ڕاویەکان کەمتر بێت ، ئیسنادەکەش ئەوەندە عالی تر دەبێت، و بە پێچەوانەوە، بە زیاد بوونی ژمارەی ڕاویەکان، ئیسناد، نازل واتە نزم دەبێتەوە. هەندێ لە زانایان پێ یان وایە دوو جۆرە (علو الاسناد )، هەیە: یەکێکیان لە ڕووی ژمارە وەك لە بەیتە کە هاتووە و شی کرایەوە، و ئەوی تر لە رووی سیفەت، واتە پیاوەکانی ناو سەنەدەکە لە ڕووی پلە و پایە و متمانە بەرزتر بن لە پیاوانی سەنەدێکی تر.

بە گشتی هەرچەندە گەیشتن بە ئیسنادی بالا هیوای هەموو ڕاویەکە، بەلام خۆی لە خۆیدا ئیسنادی بالا، نابێتە هۆی بەرز کردنەوەی پلەی فەرمودەیەکی لاواز. لە وانەیە فەرمودەیەك ئیسنادی بالا بێت بەلام ڕاوی لاوازیان لە ناو بێت یا نادیار بێت.

گەر هەموو ڕاویەکان ڕاستگۆ و جێکای متمانە بن، و ژمارەیان کەم بیت، ئەوا زۆر باشە و ئیمامی ئەحمەدی حنبل فەرمویەتی: ئیسنادی بالا سونەتی پیاوچاکانی پیشوو بووە و عەلی مە دینیش دەفەرموێت: نزم بوون( واتە لە ئیسناد) نەگریسە.[١٥]

---

[١٤] شرح المنظومة البيقونية لابن عثيمين، ص.٧٣

[١٥] شرح محمد حسن إسماعيل. ص ١٧

**١٥- وما أضفته إلى الأصحاب من قول وفعل فهو موقوف زكن**

## موقوف

دانەر لێرەو لەم بەیتە دا باس لە فەرمودەی موقوف دەکات.

وەك پیشتریش ئاماژەیەکمان پێدا، فەرمودەی موقوف بریتیە: لە و فەرمودەی دەدرێتە پاڵ صەحابی نەك پیغەمبەر صل الله علیە و سلم. ئەو فەرمودەیەش کە دەدرێتە پاڵ هاوەڵێك یا قەولیە یا فیعلی.

## پیناسەی هاوەل (صحابی):

هاوەڵ ئەو کەسەی کە بە پیغەمبەری خوا صل الله علیە و سلم گەیشتووە ئیمانی پێهیناوە و لە سەر ئیمانیش وەفاتی کردووە. بۆیە ئەم پێناسەیە وورده و مەرجی بینین دانەنراوە، بەلکو گەیشتن بە مەرج دانراوە، لە بەر ئەوەی هەندێ لە هاوەلان رەزای خوایان لێ بێت، لە خزمەت پێغەمبەرمان بوون صل الله علیە و سلم، بەلام نەیان توانی ڕوخساری موبارەکی صل الله علیە و سلم ببینن لە بەر ئەوەی نابینا بوون. هەروەها مونافیق و هەلگەراوەکانیش لێ ی دەردەچن چونکە بڕوایان پێ نەهێناوە یا دوای بڕواهێنان هەلگەڕاونەتەوە و لە سەر ئیمان نەمردوون. پێ گەیشتنەکەش گەر تەنانەت چرکەیەك بێت ئەوا مەرجی هاوەلێتی پێ دێتە دی.

## حوکمی فەرمودەی موقوف:

گەر فەرمودەکە بریتی بێت لە هەوالیکی غەیبی وەك ئەحوالی رۆژی قیامەت و کۆتا زەمان، یا پەیوەست بێت بە عیبادات کە مەجالی ئیجتیهاد کردن تیایدا نیە، ئەوا بە مەرفوعی حوکمی دادەنرێت، واتە حوکمەکەی حوکمی مەرفوعە چونکە هیچ هاوەلیك لەم جۆرە کاروبارە بە زانینی خۆی فەتوا نادات و دیارە لە بارەیەوە لە پێغەمبەری خوا صل الله علیە و سلم، شتێکی بیستووە بە لام ئاماژە ی پێ ناکات.

**١٦- ومرسل منه الصحابي سقط وقل غريب ما روى راو فقط**

## مرسل

دانەری مەنزومە رەحمەتی خوای لی بیت، بۆیە لە بەیتی پێشوو باسی لە فەرمودەی موقوف کرد و کاتی خۆی لە تەك مرفوع و مقطوع باسی لێوە نەکرد، بۆ ئەوەی بیخاتە تەك فەرمودەی مورسەل لە بەر ئەوەی هەردوکیان پەیوەندیان بە هاوەلان ( صحابی) هەیە رەزای خوای گەورە لە هەر هەمووان بێت.

وەك لە بەیتەکە دا هاتووە، فەرمودەی مورسەل: ئەو فەرمودەیە کە لە سەنەدەکەی ناوی هاوەڵەکە کەوتووە واتە تابعی راستەوخۆ لە پێغەمبەری خوا صل الله علیه وسلم، دەگێڕێتەوە و ناوی واسیتەکە ناهێنێت.

**مورسەل لە رووی زمانەوانی واتە:** ڕەها بە واتایەکی تر واتە سەرەکەی ئیسناد کراوەتەوە و گرێ نەدراوە.

## حوکمی فەرمودەی مرسل:

بە گشتی ئەم جۆرە فەرمودەیە لە جۆری فەرمودەی لاواز هەژمار دەکرێت. بەلام لە ڕاستیدا هەموو فەرمودەیەکی مورسەل لاواز نیە. بۆ نمونە، گەر هاوەڵێك لە پێغەمبەرمان صل الله علیه و سلم، فەرمودەیەك بگێرێتەوە کە لێ ی نەبیستبێت بەڵکو لە هاوەڵێکی تری بیستبێت، بەلام ناوی نەهینێت و یەکسەر لە پیغەمبەرمان صل الله علیه و سلم، بگێڕێتەوە، یا ئەو کاتە منال بووە و ئیرسال کردنی هاوەلانیش کیشە نیە چونکە هەموویان ڕاست و جێگای متمانەن. مەراسیلی تابعینەکانیش هەمویان لە یەك پلە نین بەلکو مەراسیلی هەندێ لە گەورە تابعینەکان وەك سعید ابن مسیب رەحمەتی خوای لێ بێت لە لایەن هەندێ لە زانایان وەردەگیرێت.

## غریب

**فەرمودەی غریب:** لە رووی زمانەوانی لە دووری یەوە دیت، و لە ڕووی زاراوەیی: بریتیە لە و فەرمودەی کە تەنیا یەك کەس ڕیوایەتی بکات لە بنچینەی سەنەدەکە ( واتە صحابی بیت) یا لە ناو سەنەدەکە و لە یەك تەبەقە یا زیاتر هەر یەك کەس بێت. وەك فەرمودەی بەناوبانگی ( انما الاعمال بالنیات) کە ئیمامی عومەر رەزای خوای لێ بێت بە تەنیا ڕیوایەتی دەکات و بێجگە لەو لە سێ تەبەقەی تریش هەر تەنیا یەك ڕاوی ریوایەتی دەکەن. هەرچەندە غەریب بوون گومان لە سەر لاوازی فەرمودەیەك دروست دەکات بە لام مەرجیش نیە و ناکرێتە بنەما وەك فەرمودەی سەرەوە کە فەرمودەیەکی صەحیح ە و زۆر گرنگە و بنەمای زۆر حوکمی شەرعیە.[١٦]

| | |
|---|---|
| ١٧- وكل ما لم يتصل بحال | إسناده منقطع الأوصال |

## فەرمودەی منقطع: واتە پچڕاو

**فەرمودی منقطع بە چەند واتا دێت یا خود پچرانەکە بە گوێرەی شوێن و ژمارەی راویەکان ناوی جیاوازی هەیە:**

١. لەم بەیتە دیارە کە ئەو فەرمودەی کە لە نێو سەنەدەکەی دا هەر پچرانیك هەبوو ئەوا بە منقطع واتە پچراو دادەنرێت. و هەر جۆرە پچرانێك ناویکی تایبەت بە خۆی هەیە بۆ نموونە گەر صەحابی تیا نەبوو ئەوا مورسەلە و هی تریش معضل و معلق کە دواتر باسیان لێوە دەکرێت. واتە بە پێ ی کەس و شوین و ژمارەی پچرانەکان ناوی فەرمودەکە

[١٦] بروانە سەرچاوەی پیشوو. ص. ١٨

دەگۆریت بە لام هەر هەموویان دەچنە ناو خانەی فەرمودەی منقطع. بۆیە پەیوەندی نیوان منقطع و جۆرەکانی تری فەرمودە پچڕاوەکان پەیوەندی عام و خاصە.

## جۆرەکانی پچڕان:[17]

٢. پچڕان لە سەرەتای سەنەد واتە لەو شوینەی کە دانەری کتابەکە خۆی و سەنەدەکەی دەست پێ دەکات بەم جۆرە یان دەوتریت: معلق و دەکرێت یەك کەس یا زیاتریش وون بێت و موعەلەقاتی بوخاریش حوکمەی ئەوەیە کە صەحیح و دروستن گەر بە دەستە واژەیەك دەربڕێت کە دلنیایی پیوە بێت وەك (قال فلان).

٣. پچڕان لە کۆتایی سەنەد، واتە صحابی پێ ی دەووترێت: مورسەل

٤. پچڕان لە شوێنی تر لە ناو سەنەدەکە گەر تەنیا یەك کەس بوو تەنانەت گەر لە یەك تەبەقەش بێت پێ ی دەووترێت: المنقطع.

٥. پچڕان لە ناو سەنەد، گەر دوو کەس یا زیاتر لە دوای یەك بێت، پێ ی دەووترێت: المعضل

٦.

## حوکمی فەرمودەی منقطع واتە پچڕان:

فەرمودەی منقطع چ ئەو فەرمودەی کە لە ناو سەنەد یەك کەس پچڕانی تیا بێت یا بە گشتی بە هەموو جۆرە کان بووترێت حوکمی ئەوەیە کە دەربڕی لاوازی سەنەدەکەیە.

| ١٨ ـ والمعضل الساقط منه اثنان | وما أتى مدلسا نوعان |
|---|---|

## معضل

معضل: لە زمانەوانی: اسم مفعول ە لە (اعضل) واتە بێ تاقەتی وەرگیراوە و لە زاراوە دا: بریتیە لە و فەرمودەی کە لە سەنەدەکەی دوو کەس یا زیاتر یەك لە دوای یەك کەوتبێت. گەر پچڕانەکە، یەك لە دوای یەك نەبیت، واتە لە شوینی جیاواز بێت دەبێتە منقطع.

جەوزەجانی دەفەرمویێت: فەرمودەی معضل خراپترین جۆرەکانی (منقطع) واتە پچڕانە، و منقطع یش حالەکەی لە مورسەل خراپترە و مورسەلیش بە بەلگە ناهێنریتەوە.[18]

[17] بڕوانە سەرچاوەی پیشوو. ص. ١٩

[18] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٦٣

## شیکاری فەرمودەی معضل: ( تیبینی شوینی پچرانەکە بکە)



## جۆەکانی تدلیس:

و دەڵێت ( و ما أتى مدلسا نوعان) واتە تەدلیس دوو جۆری هەیە:

| | |
|---|---|
| ١٩ـ الأول الإسقـاط للشيخ وأن | ينقل عمن فوقه بعن وأن |
| ٢٠ـ والثاني لا يسقطه لكن يصف | أوصافه بما به لا ينعرف |

سەر ەتا تدلیس لە زمانەوانی: اسم مفعولە لە تەدلیس لە (دلس ) ەوە هاتووە واتە: تاریکی، و تەدلیسیش، شاردنەوەی عەیبی کاڵایە لە موشتەری وەك پێشتریش باسمان کرد، بە گشتی واتە شاردنەوەی کەم و کوریەك، یاخود جوان کردنی سەنەدەکە.

دیارە دانەری مەنزومە رەحمەتی خەای لێ بێت، ئاماژە بە وە دەکات کە تەدلیس دوو جۆری هەیە و لە بەیتەکانی ١٩، ٢٠ دا باسیان لێوە دەکات: ئەویش (تدلیس الاسناد و تدلیس الشیوخ) ە.

### ١. تدليس الإسناد:

کاتێك ڕاوی لە کەسێك بگێڕێتەوە کە هاو سەردەمی خۆیەتی یا پێ ی گەیشتووە بەلام لێ ی نەبیستووە بە شێوازیك، وادەکات بیربکەیتەوە کە لێ ی بیستووە، بە دەستە واژە ی قال فلان، یا عن فلان بە بێ ئەوەی بە ڕاشکاوی بلێت لێم بیستووە. تەدلیس ی اسنادیش خۆی دەبێتە جۆر:

أ. **تدليس التسويه:** فڕتاندنی ڕاویەك لە نێوان دوو کەسی جێگای متمانە، کە یەکێکیان لە وی تری بیستووە. و ئەو کەسانەش کە ئەم جۆرە تەدلیسە یان کردووە: الولید بن مسلم و بقیە الولید. ئەم جۆرەش بە خراپترین جۆری تەدلیس دادەنرێت لە بەر ئەوەی لاوازی ڕاویەکە وون دەکات و دەشارێتەوە

ب. **تدليس ی عطف:** وەك ئەوەی ڕاوی بلێت: حدثنا حصین، و مغیرە عن ابراهیم و ڕاوی تەنیا لە حصین ی بیستبێت و هیچ ی لە مغیرە نەبیستبێت تەنیا ناوی بداتە پاڵ ناوی کەسی یەکەم.

ت. **تدليس ی قطع:** واتە دەستەواژەی وەرگرتن و بیستن لا ببات و تەنیا ناوی ڕاویەکانی تر بهێنێت، وەك ئەوەی بلێت الزهری عن أنس.

## ٢. تدليس الشيوخ:

كاتێك ڕاوی لە شێخێك بگێڕێتەوە كە لێ ی بیستووە، بەلام بە شێوەیەك ناوەكەی دەهێنێت، یا بە كونیە و لەقەب ناوی بهێنێت، بۆ ئەوەی كەس نەزانێت مەبەستی كێ یە. وەك لە جیاتی هێنانی ناوی( عبدالله بن المسور الهاشمی) كە كەسێكی لاوازە بلێ (عن أبو الهاشم) یاخود (عن عبیدالله الهاشمی ).

**تێبینی:** تەدلیس بە زۆری لە سەنەدە بەلام لە دەق واتە (متن) حەرامە و بە (ادراج) واتە زیادكردن لە دەق دادەنرێت. و هەر زیادەیەك لە دەق، بۆ نموونە بۆ شیكردنەوە، دەبێ ئاماژەی پێ بدرێت كە قسەی خۆیەتی و پەیوەندی بە بنچینەی دەقەكەوە نیە.

## هۆكارەكانی تدلیس:

١. لاوازبوونی ئەو ڕاویەی كە فرتێنراوە.
٢. بچووك بوونی تەمەنی ڕاوی، تەنانەت گەر جێگای متمانە ش بێت.
٣. هەبوونی ناكۆكی لە نێوان ئەو كەسەی تەدلیس دەكات و لە نێوان راویەكەدا.
٤. بۆ ئەوەی وا پیشان بدرێت كە سەنەدەكە باڵایە واتە عالیە.
٥. لە بەر هۆكاری سیاسی، وەك ئەوەی حسن ی بەسری رە حمەتی خوای لێ بێت لە سەردەمی بەنی ئۆمەیە ناوی علی كوری ئەبی تالیبی دەشاردەوە رەزای خوای لێ بێت.[١٩]

## حوكمی تدلیس:

مەكروهە، واتە زۆر نەویستراوە و زۆربەی زانایان بە خراپی باسیان لێوە كردووە بە تایبەت تەدلیس ی تەسویە. تەدلیس ی شیوخ ، نەویستراوبوونی كەمترە. تەدلیس یش گومان دروست دەكات و دەبێتە هۆكاریك بۆ لاواز كردنی سەنەدی فەرمودە، و تەنیا لەو كەسە چاوپۆشی دەكرێت كە تەنیا لە و كەسانە تەدلیس دەكەن كە جێگای متمانەن ، وەك سفیان ابن عیینە كە ئەمەش ڕای زۆرینەی زانایانە.

## جیاوازی لە نیوان تدلیس ی اسناد و مرسل خفی:

ئەوەیە كە لە تەدلیس ی اسناد، ئەو كەسەی تەدلیسی لێ دەكات فەرمودەی تری لێ بیستووە بەلام ئەم فەرمودەی لێ نەبیستووە، بەلا م لە (ارسال خفی) ئەو كەسە هەرچەندە هاو سەردەمیەتی و تەنانەت پێشی گەیشتووە بەلام هیچ فەرمودەی لێ نەبیستووە.

---

[١٩] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٦٩

هەردوكيان، لەمە يەك دەگرنەوە، كە هيچ كاميان لەم كەسە ئەو فەرمودەی نەبيستووە بەلام مودەليس، هەر نەبێت هەندێ فەرمودەی تری جگە لەم فەرمودەيە لێ بيستووە، بەلام مورسەل خەفی، هيچی لێ نەبيستوە. بۆيە تەدليس الاسناد زۆر ووردە و جياكردنەوەی سەخت ترە و شوكر بۆ خوای تعالى، زانايانی ڕخنە گری فەرمودەناس ی شارەزا و پسپۆر، وەك موو لە ماستيان هەلكێشاوە و ڕوونيان كردۆتەوە و عيلەتەكەيان دەرخستووە و لله الحمد و المنه.

لە بەيتی ١٩ باسی تدليس ی اسناد دەكات، كە بە جارێك ڕاويەك شێخێك دەقرتێنێت و بە دەستە واژەی لاواز و نەخۆشی (عن و ان )، لە سەرووی ئەم شێخە كە ناوی قرتاوە ريوايەت دەكات. لە بەيتی ٢٠ دەلێ ناوی شيخەكەی نەقرتاندووە بەلام بە وەصف و ئاكارێك يا كونيە و لەقەبێك يا ناوی عەشيرەت و وولات، ناوی دەهێنێت تا خەلك نەيناسێتەوە.

## ٢١ ـ وما يخالف ثقة فيه الملا فالشاذ والمقلوب قسمان تلا

### شاذ

لەم بەيتە دا دوو جۆری تر دەكرێت لە جۆرەكانی فەرمودە كە هيچ پەيوەنديەكيان بە يەكترەوە نيە ئەويش ( شاذ) و ( مقلوب)ە.

**شاذ:** يا نامۆ لە زمانەوانی لە (تفرد) دێت واتە پێچەوانەی زۆرينەی خەلك

لە رووی زاراوەيی: واتە ئەوەی كەسێك بگێرێتەوە كە خۆی جێگای متمانە بێت بە لام بە پێچەوانەی كەسێك يا كەسانێك بگێرێتەوە كە لە خۆی جێگای متمانە تر و دامەزراو تر بن لە رووی ژمارە يا عەدالەت يا لە بەر كردن. ئەم جۆرەش، جياوازی لە گەل (منكر) دا ئەوەيە كە ( منكر) كەسێك كە جێگای متمانە نيە پێچەوانەی كەسێك كە جێگای متمانەيە فەرمودەيەك دەگێرێتەوە.

فەرمودەی (شاذ) پێچەوانەكەی يا بەرامبەرەكەی ( محفوظ) ە واتە كاتێك كەسێك كە جێگای متمانە تر بيت پێچەوانەی كەسێك بگێرێتەوە كە لە خۆی نزمترە لە كەسانی جێگای متمانە، ئەوا پێ ی دەلێن محفوظ. واتە كاتێك ريوايەتی دوو كەس كە هەردوكيان جيگای متمانەن پێچەوانەی يەكتر دەبێت، جياوازيەك هەيە لە ريوايەتەكانيان بەلام يەكێكيان زيادتر جێگای ، ئەوا ريوايەتی كەسی جێگای متمانەی زياتر دەبێتە محفوظ و هی ئەويتريان دەبێتە شاذ.

كەسی جيگای متمانە ⟺ كەسی جيگای متمانە تر

( شاذ) ( محفوظ )

كەسی لاواز ⟺ كەسی جيگای متمانە

( منكر) ( معروف )

## جۆرەکانی شاذ واتە نامۆ

**نامۆیی دووجۆری هەیە:** هەبوونی نامۆیی لە دەق و نامۆیی لە سەنەد.

**نامۆیی لە دەق:** وەك گێرانەوەی أبو داود و تورمزی لە عبدالواحد بن زیاد، عن الأعمش، عن أبی صالح، عن أبی هریره: مرفوعا: " إذا صلی أحدكم ركعتی الفجر، فلیضطجع علی یمینة". واتە هەر كاتێك یەكێك لە ئێوە دوو ركاتەكەی بەیانی كرد با لە سەر لاڕاستەكەی پاڵ بكەوێت.

بەیهەقی دەڵێت: ( عبدالواحد) لەمەدا پێچەوانەی زۆر كەسی تری كردووە. لە بەر ئەوەی بە پێ ی ریوایەتی خەڵكی تر ئەمە لە كردەوەی پیغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم، دەگێرنەوە نەك لە قسەكەی.

هەندێ جاریش نامۆیی هەم لە دەق و هاوكات لە سەنەدیش هەیە پێكەوە بۆ نمونە:

قال الإمام أحمد فی مسنده حدیث ( ٧٦٠١): " حدثنا عبدالرزاق، أخبرنا معمر، عن الزهری، عن سعید بن المسیب، عن أبی هریره، قال: سئل النبی صل الله علیه و سلم عن الفأره تقع فی السمن فقال: " إن كان جامدا، فألقوها و ماحولها، و إن كان مائعا فلا تقربوه". واتە پێغەمبەری خوا صل الله علیه و سلم دەربارەی مشك گەر بكەوێتە ناو ڕوون فەرموی: گەر ڕوونەكە بەستی بوو ئەوا خۆی و دەورادەورەكەی فڕێ بدەن و گەر ڕوونەكە ڕۆن بوو ئەوا نزیكی مەكەون.

ئەم فەرمودەیە، پیاوەكانی جێگای متمانەن، پیاوی دوو شیخەكەن ( بوخاری و موسلیم)، كە لییان دەگێرنەوە، بەڵام (معمر) لە سەنەدەكەی هەڵەی كردووە بە جۆریك لە زوهری لە ابن مسیب لە ئەبو هورەیرە دەگێرتەوە، بەڵام قوتابیەكانی زوهری پێچەوانەی ئەو دەگێرنەوە بەم شیوەیە: لە زوهری لە عبیدالله بن عبدالله بن عتبە لە ابن عباس رەزای خوای لی بیت لە میمونە، هەروەها لە دەقەكەش هەڵەی تیدایە لە بەر ئەوەیزیادەی هەیە و ئەو زیادەیەش نامۆیە ( و إن كان مائعا، فلا تقربوه) و ئەم زیادەیە لە صحیح ی بوخاری دا نەهاتووە. [٢٠]

## حوكمی شاذ واتە نامۆ:

لاوازە بە پێچەوانەی (محفوظ) كە جێگای قبوڵ كردنە.

**تیبینی:** جیاوازی هەیە لە نێوان فەرمودەی نامۆ و (زیادة الثقة)، لە بەر ئەوەی ئەو بە شەی كە كەسێكی متمانە تیایدا جیاواز لە كەسی لە خۆ متمانە تر ریوایەت دەكات دەكات پێچەوانەی دەقی ئەوانەوە واتا دەگەینێت. بەڵام گەر كەسێك یا زیاتر لە

[٢٠] سامسونیة في شرح البیقونیة، أبو عبدالله لیث الحیالي، ص. ٧٤

کەسانی جێگای متمانە، زیادەیەك لە ریوایەتەکەیان هەبێت کە لە ناو ریوایەتی ئەوانی تر دا نەهاتوە و واتای پێچەوانەش نەگەینێت ئەوا دەبێتە زیادەی کەسی متمانە و بە گشتی لای زۆربەی فەرمودەناسان جێگای وەگرتن و پێ قایل بوونە.

لە بەشی دووەمی ئەم بەیتە باسی فەرمودەی مەقلوب واتە سەراوژێر دەکات کە هیچ پەیوەندی بە فەرمودەی نامۆ نیە تەنیا لە بەیتەکە جیگایان بۆ کراوەتەوە.

## فەرمودەی مقلوب و اتە سەراوژێر:

لە زمان مقلوب اسم مفعولە لە قلب واتە شتێك بە شتێکی تر بگۆریەوە

و دوو جۆریشی هەیە: سەراوژێر کردن لە دەق و سەراوژێر کردن لە سەنەد.

................................ وَٱلۡمَقۡلوبُ قِسمَانِ تَلا

٢٢ إِبْدَالُ رَاوٍ مَابِرَاوٍ قِسْمُ وَقَلبُ إِسنادٍ لِمَتْنٍ قِسْمُ

گۆرینی ڕاویەك بە یەکێکی تر، یا زیاتر لە ڕاویەك ، یا خود هەموو سەنەدەکە، بریتیە لە سەراوژێر کردنی سەنەد و ئەم جۆرەش بۆ چەند مەبەست دەکرێت:

- بە ئەنقەست بە مەبەستی ئەوەی نامۆ بێت بە درۆ، ئەمەش کاری درۆزن و ئەوانەیە کە فەرمودە هەلدەبەستن وەك : حماد بن عمرو النصیبی.
- بە ئەنقەست وا بکریت بۆ تاقی کردنەوە، ئەمەش شعبە زۆر وای دەکرد بۆ تاقیکردنەوەی ئاستی لە بەر کردنی ڕاویەکان.
- سەراوژێر کردن بە هەلە.

هەندێ جار پیش و پاش دەکرێت لە ناوی راوی و باوکی وەك ( مرة ابن کعب و کعب ابن مرة).

## جۆری دووەمیان سەراوژێر کردنە لە دەق وەك ئەم فەرمودەیە:

وەك فەرمودەی ئەبو هوریرە رەزای خوای لێ بێت، دەربارەی ئەو حەوت پۆلەی کە لە ژێر سێبەری عەرشی خوای تعالا دانە، کە یەکێکیان، پیاوێکە کە صەدەقەیەك دەدات و دەیشارێتەوە هەتاوەکو دەستی راستی نەزانیت چی بە دەستی چەپ بەخشیوە، ئەمەش سەراوژێر کردنی تێدایە لە دەق کە راستیەکەی ( حتی لا تعلم شماله ما تنفق یمینه) هەتا چەپەکەی نەزانیت بەوەی کە بە راستەکەی بەخشیوە.

نمونەی تاقیکردنەوەش بە سەراوژێر کردنی سەنەد و دەقەکان تاقیکردنەوی ئیمامی بوخاریە لە لایەن زانایانی بەغداد کاتێك سەد فەرمودە سەراوژێر ئەکەن لە رووی سەنەد و دەقەکانیان، و ئیمامی بوخاری رەحمەتی خوای لێ بێت هەر هەمووی بۆ راست کردنەوە.

## ٢٣- والفرد ما قيدتـه بثقة أو جمع أو قصر على رواية

### فرد واتە تاك

ئەم بەیتە باس لە فەرمودەی ( فرد) دەكات. فەرد لە زماندا واتە تاك و لە رووی زاراوە واتە: کاتێك ڕاویەك بە تەنیا فەرمودەیەك بگێرێتەوە وەك فەرمودەی ( انما الأعمال بالنيات) و بە زۆری ئەم جۆرە ڕیوایەتە تاكانە مەزەندەی لاوازێتیە بەلام هەندێكیان پەسەند دەكرێن، نەخاسمە کاتێك بە تەنیا ریوایەت کردن لە سەردەمە زووەکان بوو بێت ( هاوەڵان و تابعين و تابعی تابعين)، بەلام لە دوای سێ سەدەکە، ڕاویە کان ژمارەیان زۆر بوو بە جۆرێك ڕاوی هەبووە کە شەس سەد کەس ریوایەتیان لێ کردووە، بۆیە کاتێك لەو هەموو ژمارە زۆرە، تەنیا یەك کەس فەرمودەیەك لە مامۆستای خۆی بگێرێتەوە کە قوتابیەکانی تری ریوایەتیان لێ ی نەکردووە ئەوا گومان دروست دەبێت.[٢١]

لەم بەیتە باسی سێ جۆر لە ریوایەتی فرد واتە تاك دەکرێت:

١. ریوایەت لە ریگای متمانە پێکراوێك: وەك فەرمودەی پێشوو ( انما الأعمال بالنيات) لە بەر ئەوەی لە ٤ توێژ ریوایەتی بە تەنیا هەیە و لە گەل ئەوەش چونکە هەموویان متمانە پێکراون بۆیە پەسەند کراوە و صحيحه.
٢. ریوایەت لە لایەن کۆمەلێك ی دیاریکراو وەك خەلکی شارێك یا عەشیرەتێك کاتێك بە تەنیا فەرمودیەك لە خەلکی بۆ نموونە شام یا حجاز ریوایەت دەکەن، ئەمەش پێ ی دەلێن (الفرد النسبى) واتە تا ڕادەیەك تەنیا گێرانەوەیە. یا خود یەك کەس لە کۆمەلێك یا کۆمەلێك لە یەك کەس یا کۆمەلێك لە کۆمەلێك.[٢٢]
٣. سنوردار کردن بە ریوایەتێك، بۆ نمونە کاتێك دەووترێت ئەم فەرمودەیە بەم مانایە تەنیا لە لایەن فلان کەس ریوایەت کراوە ئەگینا ئەم فەرمودەیە بە رێگای تر ریوایەت کراوە و بە ناوبانگە.[٢٣]

نمونەش بۆ ئەم جۆرە فەرمودەیە:[٢٤]

جۆری یەکەم: عن ضمرة بن سعيد المازني عن عبيدالله بن عبدالله أن عمر بن الخطاب رضي الله عنه سأل أبا واقد الليثي ما كان يقرا بة رسول الله صل الله علية و سلم في الأضحى و الفطر فقال كان يقرأ فيهما ب ق و القران المجيد و اقتربت الساعة و انشقت

---

[٢١] شیکردنەوەی شيخ ابن عثيمين مكتبة شاملة ل. ٩٩
[٢٢] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٧٩
[٢٣] شرح محمد حسن إسماعيل. ص ٢٢
[٢٤] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٨٠

القمر. لەم فەرمودەیە تەنیا ضمرة بن سعید لة عبیداللە بن عبداللە لە أبي واقد اللیثي دەگێڕێتەوە و هیچکام لە متمانە پێکراوەکان جگە لە ضمرة ریوایەتیان نەکردووە.

جۆری دووەم : قال الحاكم: ما حدثناه أبو نصر أحمد بن سهل الفقيه، ببخارى، قال: ثنا صالح بن محمد بن حبيب الحافظ، قال: ثنا علي بن حكيم، قال: ثنا شريك، عن أبي الحسناء، عن الحكم بن عتيبة، عن حنش، قال: كان علي رضي الله عنة يضحي بكبشين، بكبش عن النبي صل الله علية و سلم و بكبش عن نفسة، و قال: كان أمرني رسول الله صل الله علية و سلم أن أضحي عنة، فأنا أضحي عنة أبدا. حاكم دەڵێت: لە سەرەتای سەنەد تا کۆتاییەکەی تەنیا خەڵکی کوفە ریوایەتیان کردووە و جگە لە وان خەڵکی تری تیا نیە.

جۆری سێیەم: عن بريدة، عن أبيه، عن رسول الله صل الله علية و سلم قال: القضاة ثلاثة: إثنان في النار، و واحد في الجنة، رجل علم الحق فقضى به فهو في الجنة و رجل قضى للناس على جهل فهو في النار و رجل جار في الحكم فهو في النار لقلنا ان القاضي غذا إجتهد فهو في الجنة. لەم فەرمودەیە تەنیا خەڵکی ( مرو) لە عبداللە بن بریدە لە باوکی دەگێڕنەوە.

## ٢٤- وما بعلة غموض أو خفا معلل عندهم قد عرفا

### معلول

مەبەست لەم دێرە فەرمودەی ( معلول) ە کە ناوی تریشی هەیە لە وانە ( معل) و ( معلل) بەلام لە رووی زمانەوانی (معل) تەواوترە. پێش شیکردنەوەی مانای بەیتەکە، پێویستە مانای ( علە) بزانین. پێناسەی (علە) یا هەمان نەخۆشی خۆمان: بریتیە لە ئاکارێکی شاردراوە کە توانج لێ بدات لە راست و دروستی سەنەدەکە و تەنیا لە ناو زانایان، پسپۆرانی شارەزا، لێ ی بە ئاگان وەك علی بن مدینی و احمد بن حنبل و بوخاری و ئەبو حاتم و ئەبو زورعە و دارەقوتنی رەحمەتی خوای تعالی لە هەمویان بیت.

فەرمودەی ( معل) لە ڕوالەتە کەیدا صەحیحە بەلام لە ڕاستیدا (علە) یەکی شاراوەی هەیە کە توانجی پێ لێ دەدرێت بۆ نمونە: دەووترێت: فلان کەس دوای مردنی ئەو شێخەی کە ریوایەتی لێ کردووە چووە شارەکەی (واتە بە شیخە کە نەگەیشتووە).[٢٥]

بۆیە لەم دێرە دانەری مەنزومە رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت ئەو عیلە تە ی کە نادیار و شاراوەیە لای فەرمودەناسان بە فەرمودەی معلل ناسراوە. و زانستێك هەیە بە ناوی ( علل الحديث) کە بە سەخت ترین زانست دادەنرێت لە نیوان زانستەکانی فەرمودە ناسی و ژمارەیەکی زۆر کەم لێ ی هەلکەتون و وەك ئاماژە بە هەندێکیان درا. ئاشکرا کردنی عیلەتەکانیش شارەزایەکی زۆر بە رفراوانی دەوێت لە گێرانەوەی فەرمودە و حالی راویەکان و زانینی زۆربەی ریگاکان و سەنەدەکان.

[٢٥] شرح محمد حسن إسماعيل. ص ٢١

## و عیلە تی کاریگەریش دووجۆرە:

١. عیلەت لە سەنەدەکە و ئەمەیان زیاتر باوە. وەك : حديث يعلى بن عبيد الطنافسي، عن الثوري، عن عمرو بن دينار حديث" البيعان بالخيار" (يعلى) هەلەی کردووە و (عبدالله بن دينار)ە نەوەك (عمرو بن دينار).

٢. عیلەت لە دەق. بۆ نمونە: ما رواه أبو داود، و الترمذي: من طريق عبدالواحد بن زياد، عن الأعمش، عن أبي صالح، عن أبي هريرة رضي الله عنه مرفوعا: إذا صلى أحدكم ركعتي الفجر فليضطجع على يمينة. بەیهەقی دەلێت: عبدالواحد موخالەفەی خەلکێکی زۆری کردووە لە بەر ئەوەی خەلکی لە کردەوەی پیغەمبەری خوا صل الله عليه و سلم ریوایەت دەکەن نەك لە زاریەوە، هەروەها عبدالواحد لە نێوان قوتابیەکانی (أعمش) ئەوانەی کەجێگای متمانەن بە تەنیا بەم دەربڕینە ریوایەتی دەکات.[٢٦]

## ٢٥ـ وذو اختلاف سند أو متن مضطرب عند أهيل الفن

## مضطرب

**فەرمودەی (مضطرب ):** لە زمانەوانی واتە جیاوازی یا پەرێشانی، و اسم مفعولە لە (اضطراب) ەوە هاتووە واتە جوولە کردن بە نارێکی و لە زاراوە: بریتیە لە و فەرمودەی کە ڕاویەکان لە سەنەد یا دەقەکەی بە جۆرێك جیاوازیان هەیە کە ئەگەری (جمع کردن) واتە کار کردن بە هەر دوو فەرمودە یا (ترجيح) واتە پێش خستنی یەکێکان بە سەر ئەوی تر نیە.

**جیاوازی لە سەنەد:** بۆ نمونە هەندێکیان بە نەپچراوی و هەندێك بە پچراوی ریوایەت بکەن.

**جیاوازی لە دەق:** هەندێك بە مەرفوعی ریوایەتی بکەن و هەندێکی تر بە مەوقوفی.[٢٧]

بۆیە دانەری مەنزومە رەحمەتی خوای لێ بێت دەلێت ئەوەی ( واتە ئەو فەرمودەی) کە لە سەنەد یا دەقەکەی جیاوازی هەیە لای شارازایانی ئەم زانستە واتە فەرمودە ناسان (مضطرب) واتە پەرێشان ي پێ ئەو ترێت.

**و جیاوازی ڕاویەکانیش چەند جۆری هەیە:** یا لە یەك ڕاوی بە دی دەکرێت، کاتێك هەمان ڕاوی جارێك بە شێوەیەك بگێڕێتەوە و جارێکی تر بە جۆرێکی تر، یا لە لایەن چەند ڕاویەکەوە یە، بە جۆرێك هەر ڕاویەك بە پێچەوانەی ئەوانی تر بگێڕێتەوە.

لە پێناو ئەوەی فەرمودەیەك بە (مضطرب) بژمێردرێت دوو مەرج هەیە:

---

[٢٦] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٨٣

[٢٧] شيكردنەوەی شيخ ابن عثيمين مكتبة شاملة ل. ١٠٤

١. شێوەی جیاوازیەکان یەکسان بن، واتە لە ڕووی هێزی ڕاویەکان و جێگای متمانە بونیان و دەرەجەی فەرمودە هاوشان بن. بۆیە لە کاتی هەبوونی جیاوازی لە نێوان فەرمودەیەکی صەحیح و یەکێکی تر کە لاوازە ئەوا یەکسانی نیە و صەحیحەکە بە هێزترە و پێش دەخرێت و ترجیح دەکرێت.

٢. بە پێ ی بنەماکانی فەرمودەناسان توانای کارکردن بە هەردوو فەرمودە نەبێت یا نەکرێت لە نێوانیان ترجیح بکرێت.[٢٨]

نمونەی ئەو فەرمودانەی کە جیاوازیان هەیە بەلام دەکرێت لە نێوانیان جمع بکرێت ( واتە کار بە هەموان بکرێت):

چۆنیەتی ئەنجام دانی حەجی پێغەمبەرمان صل الله علیه و سلم: هەندێك وا دەگێڕنەوە کە بە (مفرد) ی حەجی کردووە صل الله علیه و سلم ، و هەندێك بە (مقرون ) و هەندێکیش بە (تمتع) یان داناوە. بەلام زانایان بە لە بەر چاو گرتنی (افراد ) لە کردەوەکان بە( افراد) یان تاویل کردووە ، و بە پێ ی کۆکردنەوەی حەج و عومرە لە یەك سەفەر بە (تمتع)یان تاویل کردووە و بە پێ ی ئەنجامدانی هەردوکیان حەج و عومرە لە ڕووی واقیع بە (مقرون) یان داناوە. کە واتە توانرا کار بە هەر سێ جۆرە ریوایەت بکرێت و هیچ کامیان پاش گوێ نەخرا. هەروەها بنەمایەکی بنچینەیی هەیە دەلێت (الإعمال أولى من الإهمال) واتە کار پێ کردن لە پاش گوێ خستن لە پێش ترە، و هەروەها (جمع) یش بە کۆدەنگی زانایان لە پێش (ترجیح) ە.

هەروەها دەبێت جیاوازی لەسەر بنچینە و بابەتێکی سەرەکی بێت لە فەرمودە و لە سەر شتێکی لاوەکی نەبێت. بۆ نمونە لە فەرمودەی کڕینی ووشترەکەی جابر بن عبدالله رەزای خوا لە خۆی و باوکی بێت لە لایەن رسول الله صل الله علیه و سلم، سەبارەت بە نرخی کڕینەکەی ریوایەتەکان جیاوازن بەلام چونکە نرخ شتێکی لاوەکیە، و هیچ لە بنچینە دا ناگۆرێت ئەوا بە (اضطراب) ناژمێردرێت.

## ٢٦- والمدرجات في الحديث ما أتت من بعض ألفاظ الرواة اتصلت

### مدرج

جۆری بیست و چوارەم لە فەرمودەکان لەم مەنزومەیە مودرەجە.

مدرجات لە زمانەوانی واتە: کۆی (مدرج)، واتە شتێك بخەیە ناو شتێکی تر

لە ڕووی زاراوەش: واتە: کاتێك یەکێك لە ڕاویەکان شتێك بخاتە ناو فەرمودە بە بێ ئەوەی باسی بکات کە لە کیس خۆیەتی، و دەکرێت لە سیاقی سەنەدەکە بێت یا لە دەقەکەی بێت.

چۆن دەزانرێت ئەم زیادەیە لە ڕاویەوە خراوەتە نێو فەرمودە و لە بنچینەی فەرمودەکە دا نیە؟

وولام: بە چەند شێوەیەك:

[٢٨] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٨٦

١. لە ڕێگەیەکی تر فەرمودەکە ریوایەت بکرێت و ڕوونی بکاتەوە کە زیادەی ریوایەتەکەی تر (ادراجە) واتە زیادەی خۆیەتی.

٢. مەحال بێت ئەو زیادەیە بدرێتە پاڵ رسول الله صل الله علیه و سلم، بە هۆی ئەوەی کە هەلەیەك هەبێت یا قەرینەیەك هەبێت گوزارش لەمە بکات.

ئیدارجیش لە دەق چەند جۆرێکە:

- **لە سەرتای دەقەکە بێت** کە ئەمەیان دەگمەنە وەك ئەو فەرمودەی کە دەربای دەست نوێژ ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێت لە پیغەمبەری خۆشەویست صل الله علیه و سلم ریوایەت دەکات دەفەرموێت: ( أسبغوا الوضوء ویل للأعقاب من النار). (أسبغوا الوضوء) ووتەی ئەبو هورەیرەیە رەزای خوای لێ بێت خراوەتە نێو فەرمودە. ئەمەش لە ڕێگەی ترەوە زانراوە چونکە ئەم ڕستەیەی تیا نەبووە.

- **ئیدارج لە ناوەراستی فەرمودە:** وەك ئەو فەرمودەی کە خێزانی ئەبوهورەیرە (بسرە بنت صفوان) رەزای خوا لە هەردوکیان بێت، دەلێت گوێم لە رسول الله بوو صل الله علیه و سلم فەرموی: ( من مس ذكرة أو أنثيية أو رفغية فليتوضأ) لەم فەرمودەیە (أو أنثيية أو رفغية) ئیدراجی عوروەیە کە لە ڕیگەیەکی تر هاتووە، أنها قالت سمعت رسول الله صل الله علیه و سلم یقول: ( من مس ذكره فليتوضأ) ، و كان عروة يقول: إذا مس رفغيه أو أنثييه أو ذكره فليتوضأ.

- **لە کۆتایی فەرمودە**، ئەمەش زیاتر باوە: وەك: ما أخرجه الشيخان من طريق يونس عن الزهري، قال: سمعت سعيد بن المسيب، يقول: قال أبو هريرة رضي الله عنه: قال رسول الله صل الله عليه و سلم: ( العبد المملوك الصالح أجران)، و الذي نفسي بيده لولا الجهاد في سبيل الله و الحج و بر أمي لأحببت أن أموت و أنا مملوك. لەم فەرمودەیە (و الڑی نفسی بیده لولا ....) لە کەلامی ئەبو هورەیرەیە رەزای خوای لێ بێت لە بەر ئەوەی مەحالە ئەمە رسول الله صل الله علیه و سلم، وا بفەرموێت چونکە بە منالی دایکی لەدەست داوە هەتاوەکو خزمەتی بکات و ناکرێت صل الله علیه و سلم، کە باشترین خەلقی خوایە خۆزگە بە کۆیلایەتی بخوازێت. [٢٩]

هۆکارەکانی دروست بوونی ئیدارج لە فەرمودە:

١. کاتێك، ڕاوی بیەوێت هەندێ ووشەی نامۆ، شی بکاتەوە لە نیو دەقەکە دا.

٢. کاتیك، ڕاوی بیەوێت حوکمێك لەم فەرمودەیە باس بکات وەك ئەوەی لە ووتەی عوروە بینیمان.

٣. کاتیك، ڕاوی بیەوێت حوکمێك بچەسپێنێت وەك فەرمودەی ئەبو هورەیرە بە مەرفوعی کە لە سەرەوە باس کرا.

[٢٩] سامسونیە فی شرح البیقونیە، أبو عبدالله لیپ الحیالی، ص. ٩٠

## ٢٧- وما روى كل قرين عن أخـه          مدبج فاعرفه حقا وانتخه

### مدبج

لێرە باسی (مدبج) کراوە و بۆ ئەم مەبەستەش پێش زانینی واتای مدبج دەبیت باسی واتای (أقران) بکرێت.

لە بەیتەکە دا هاتووە مدبج بریتیە لە و فەرمودەی کە هەر ( قرين) ێك لە ( قرين ) ی خۆی ریوایەت دەکات.

### قرين

**قرين**: لە زمانەوانیدا واتە: هاوشان و هاووێنە

**الأقران**: واتە ئەو کۆمەلە خەلکەی کە هاوشێوەی یەکترن لە ڕووی تەمەن یا لە گێرانەوەی فەرمودە لە مامۆستایەك لە یەك تەبەقە واتە لە یەك سەردەم بوونە.

(**مدبج**) لە زمان واتە: ڕازاوە، بۆیە ناوی لێنراوە لە بەر جوانیەکەی و (تدبيج) لە دوو لاڕوومەتەکەی دەم و چاو هاتووە.

لە زمانەوانیدا: واتە کاتێك دوو قەرین و هاوشان لە یەکتر ڕیوایەت دەکەن کە لە تەمەن و سەنەد لێك نزیکن، بۆیە بە مدبج ناونراوە لە بەر ئەوەی وەك دوو دیوی یەك دەم و چاو لە یەك تەبەقە دان.

<u>**تێبینی**</u>: گەر تەنیا یەکیك لە هاوشانەکان لە ئەوی تر ریوایەت بکات ئەوا پێ ی دەوترێت: (روايه الأقران) بە لام گەر هەردوکیان لە یەکتری ریوایەت بکەن دەبیتە (مدبج).

**نمونەیان**: لە هاوەلەکان: دایکە عائیشە لە ئەبو هورەیرە وە رەزای خوایان لێ بێت ریوایەتی کردووە و هەروەها بە پێچەوانەشەوە ئەبو هورەیرەش لە دایکمان عائیشە رەزای خوایان لێ بێت ریوایەتی کردووە.

لە تابعین: عمر بن عبدالعزيز لە زوهری و بە پێچەوانەشەوە وە ریوایەتیان لە یەکتر کردووە.

لە تابعی تابعین: مالك بن انس لە ئەوزاعی و بە پێچەوانەشەوە.

لە ئەتباعی ئەتباع: وەك ریوایەتی ئیمامی ئەحمەدی حنبل لە عەلی مەدینی و بە پێچەوانەوە. [٣٠]

لە کۆتایی بەیتەکە دەلیت ( فأعرفه حقا و انتخه) واتە بەراستی بیزانە و شانازی بکە بە زانینی ئەو زانیاریە گرنگە.

---

[٣٠] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٩٤

## گرنگی زانینی ( مدبج):

ئەوە یە کە گومانت لا دروست نابێت کە لە سەنەدەکە کەسێك زیادە لە بەر ئەوەی هەردوو ڕاویەکە لە یەك ئاست یا سەردەم ژیاون بەلکو دەزانی ئەمانە هەرچەندە لە یەك ئاستن بەلام لە بەر ئەوەی فەرمودەیان لە یەکتر گێراوەتەوە ئەوا بوونی ناوی هەردوکیان لە یەك سەنەد کێشە نیە و گوماناوی نیە.[31]

لە تەك ئەم جۆرە ریوایەت کردنە ریوایەتی گەورە لە بچوك ( لە ڕووی تەمەن) و ڕیوایەتی هاوەل لە تابعین و ریوایەتی باوك لە کوڕ هەیە، و ئەمەش خاکە ڕایی بوونی ڕاویەکان و دلسۆزیان بۆ دین دەگەینێت. وەك ریوایەتی عباس لە فەزلی کوڕی خۆی رەزای خوایان لێ بێت، و ڕیوایەتی هاوەلان لە تابعی وەك: ئەبو هورەیرە و موعاویە و ئەنەس رەزای خوایان لێ بێت لە کعب الاحبار رەحمەتی خوای لێ بێت کە تابعی بووە.

گەر مامۆستا لە قوتابیەکەی بگێڕێتەوە و جیاوازی لە نیوان سالی وەفاتیان هەبیت ئەوا بە ( السابق و اللاحق) دادەنرێت وەك ڕیوایەتی بوخاری لە قوتابیەکەی ابی العباس السراج لە کتابی ( التاریخ).[32]

| | |
|---|---|
| ٢٨- متفق لفظا وخطا متفق | وضد فيما ذكرنا المفترق |

## متفق و مفترق

لەم دێڕە دوو جۆری ترباسکراون کە ئەوانیش ( متفق) و ( مفترق) ە.

دانەر لە بەیتەکە دەلێت: (متفق) واتە یەك گرتنەوە، بریتیە لەوەی کە لە ڕووی نوسیەوەن و دەستەواژە یە ك بگرنەوە ،واتە بە تەواوی لە یەك بچن و پێچەوانەکەشی (مفترق) ە.

با بزانین لە رووی زمانەوانی و زاراوەیی و کردەیی ئەم دووانە چین.

### متفق:

واتە هاوڕا بوون و لێرە بە واتای یەکگرتنەوە دێت لە ڕوالەت و شێوازی نوسینەوە

لە زاراوەش دا: هەروەك ابن کثیر رەحمەتی خوای لێ بێت لە کتابی خۆی (الباعث الحثیث) دا دەلێت: بریتیە لەوەی کە دوو کەس یا زیاتر لە ڕاویەکان ناوی خۆیان و ناوی باوکیان وەك یەك بێت بۆ نمونە: ( الخلیل ابن أحمد) شەش کەس بەم ناوە هەنە لە ناو

[31] شەرحی زرقانی لە گەل پەراوێزی الاجهوری ل. ٢٠٤

[32] شەرحی زرقانی لە گەل پەراوێزی الاجهوری ل. ٢٠٧

راویەکان.[٣٣] ئەمەش زانستێکی زۆر گرنگە لە بەر ئەوەی لە وانەیە چەند ڕاوی بەو ناوە هەبن، کە هەر یەکە لەمانە، هەندێکیان جێگای متمانە بن و هەندێکی تر لاواز بن یا لەوانەیە هەردووکیان بە یەك ناو بن و تەنانەت لە یەك سەردەم و شوێن ژیا بن یا بە پێچەوانەوە خەلکی شوێن و سەردەمی جیاواز بن. ئەمەش زۆر گرنگە لە بەر ئەوەی زانینی ئەوەی ئەم راویە کامەیانە، کار دەکاتە سەر حوکمی فەرمودەکە بۆ ئەوی بزانین بە یەك گەیشتوون و فەرمودەیان لە شێخی خۆیان وەرگرتووە یا نە.

ئەمەش چۆن دەزانرێت و چۆن لێك جیا دەکرێنەوە؟ و. بە هۆی کۆکردنەوەی ڕێگا جیاوازەکانی یەك فەرمودە و هەروەها بە سرنج دان لە ناوی قوتابی و شێخەکانی راویەکە، و بەراورد کردنیان بە زانیاریەکانی ڕاویەکانی تر کە هەلگری هەمان ناون لە کتابەکانی (رجال و تراجم).

**تێبینی:** متفق و مفترق تەنیا پەیوەستە بە سەنەد و لە دەق دا نیە. هەروەها کاتێك کە هەردوکیان جێگای متمانە بن (واتە ڕاویەکان) ئەوا کێشە نیە بەلام کاتێك یەکێکیان لاواز و یەکیکی تر متمانە پێکراو وجێگیر بێت ئەوا دەبێت یەکلایی بکرێتەوە.

موفتەریق یش واتە جیاواز و ریك پێچەوانەی ئەوەی یەکەمە واتە کاتێك ناوی راویەکان و باوك و کونیە و نازناویان لێك جیا بێت. کە ئەمە ئاساییە و زۆربەی ڕاویەکان لە مانە جیاوازن و خەتیبی بەغدادی ڕەحمەتی خوای لێ بێت کتابێکی لە سەر داناوە.

## ٢٩- مؤتلف متفق الخط فقط وضده مختلف فاخش الغلط

## مؤتلف و مختلف

(مؤتلف) جۆرێکی ترە و پێچەوانەکەشی (مختلف)ە

مؤتلف: واتە کاتێك لە شێوازی نوسین ناوەکان وەك یەك بن بەلام لە دەربڕین و خوێندنەوە جیاواز بن.

ابن صلاح شارەزوری دەلێت ئەمە بریتیە لە زانینێکی بە پیز و گرنگ، و ئەوەی لە فەرمودەناسان لێ ی بێ ئاگا بێت تووشی هەلەی گەورە دەبێت. و خۆیشی کتابێکی لە سەر داناوە.

نمونەش بۆ ئەم جۆرە ناوانە: ( سلّام) بە تشدیدی لام و بە بێ شەدە هەروەها (عُمارة) بە زەمی عەین و بە کەسری عەین لە فەتح و زەم و سکون و شەدە یا بە هۆی جیاوازی پیتێك لە ناوەکە وەك ریاح و رباح، و شریح و سریج، یا جیاوازی دوو پیت بەلام لە شیوازی نوسینەکە لێك نزیك بن وەك: العنسي و العيشي و العبسي.

سوودی ئەم زانستەش وەك جۆری پێشوو بۆ جیاکردنەوەی ڕاویەکان دێت و زۆر جار بە هۆی ئەوەی پلەی ڕاویەکان جیاوازە لە ڕووی متمانە و جێگیر بوونی لە بەر کردن ئەوا حوکمی فەرمودەکە دەگۆڕێت.

---

[٣٣] الباعث الحثيث، ابن كثير، ل ١٢٦

ئەم زانستەش لەم سەردەمە بە تایبەت بۆ ئەوانەی كە كاری تحقیق واتە بە دواداچون دەكەن بۆ دەستنوسەكان زانستێكی گرنگە.

**٣٠- والمنكر الفرد به راو غدا        تعديله لا يحمل التفردا**

## منكر

منكر لە زمانەزانی: پێچەوانەی (معروف)ە واتە چاكە و لە زاراوەدا واتە: گێرانەوەی لاوازێك كە جیاواز بێت لە كەسێك كە لە خۆی لە پێشترە.

منكر لە نێوان زانایان جیاوازی هەیە لە سەری ، هەندێ پێ یان وایە (منكر) بریتیە لە ڕیوایەت كردنی كەسێكی لاواز بە جۆرێك گێڕانەوەی جیاواز بێت لە گێڕانەوەی كەسێكی متمانە پێكراو، تەنانەت گەر هەردوو ڕاویەكە قوتابی یەك شیخیش بن. هەندێكی تریش (منكر) یان بەوە پێناسە كردووە كە گێڕانەوەی تەنیا یەك كەس بێت بە جۆرێك ئەم كەسە بە تەنیا گێڕانەوەی جێگای قبولٍ كردن نەبێت و هەر ئەمەش مەبەستی دانەری مەنزومەیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت.[٣٤]

ئەمەش روونە لە بەیتەكەدا، لە تەك (منكر) ووشەی ( فرد) ی هێناوەتەوە و دەلێت (منكر) ی فرد ئەوەیە كە تەنیا یەك ڕاوی ریوایەتی بكات بە جۆرێك پلە و پایەكەی لە ڕووی جرح و تعدیل ڕێگەی پێ نادات بە تەنیا ریوایەتەكەی لێ قبول بكرێت. بەم مانایە كە دانەری مەنزومە هیناویەتەوە ئەوا ئەم جۆرە هەمان فەرمودەی (غەریب)ە، و تەنانەت بە هەبوونی شواهد واتە ڕێگەی تری هەمان فەرمودە كە صەحابیەكی تر ڕیوایەتی بكات، پلەی ئەم فەرمودە (غەریب) ە بەرز ناكاتەوە بۆ حەسەن لە بەر ئەوەی لاوازێتیەكەی گەورەیە، هەروەك ابن حجر لە (نخبة الفكر) باسی لێوە كردووە.[٣٥]

## سوود لە پۆلێن كردنی فەرمودەی منكر چیە؟

١. بەیهەقی رەحمەتی خوای لێ بێت دەلێت: (منكر) پشتی پێ نابەسترێت و بەلگەی پێ ناهێنرێتەوە.
٢. ابن صلاح، جیاوازی ناكات لە نێوان منكر و شاذ و لای ئەو هەردوكیان یەك شتە.
٣. ابن حجر دەلێت: ئیمامی ئەحمەد و نەسائی رەحمەتی خوایان لێ بێت، و كەسی تریش لە ڕخنە گران تەنیا بە گێڕانەوەی تاكە كەسێكیان ووتوە (منكر) كە لەو پایە نەبیت تاك گێڕانەوەكەی لێ وەربگیرێت.[٣٦]

---

[٣٤] شیكردنەوەی شیخ ابن عثیمین مكتبة شاملة ل. ١١٨

[٣٥] شیكردنەوەی شیخ ابن عثیمین مكتبة شاملة ل. ١١٨

[٣٦] سامسونية في شرح البيقونية، أبو عبدالله ليث الحيالي، ص. ٩٨

## ٣١- متروكه ما واحد به انفرد وأجمعوا لضعفه فهو كرد

### متروك

متروك لە زمانەوانیدا: اسم مفعوله لە (ترك) هاتووە، واتە وازلێ هێنان و لە زاراوە واتە: ئەو فەرمودەی کە لە ناو ئیسنادەکەی ڕاویەك هەبێت کە بە درۆکردن تاوانبار کراوە.

لە بەیتەکەش دا هاتووە مەتروك ئەوەیە کە ڕاویەك بە تەنیا ریوایەتی بکات و ڕخنەگران لە سەر لاواز بوونی ئەم ڕاویە کۆك بن و بۆیە ۆڕیوایەتەکەی ڕەت دەکرێتەوە.

هۆکارەکانی تۆمەتبارکردنی راویەك بە متروك دوو شتە:[٣٧]

١. ئەم فەرمودەیە تەنیا لە ڕێگەی ئەم راویە گێردرابێتەوە و پێچەوانەی بنەما کارپێکراوەکان بێت.
٢. ڕاویەکە لە قسەی ئاسایی خۆی درۆی لێ بینراوە بەلام لە فەرمودەی پیغەمبەرمان صل الله علیه و سلم ، ئەمەی لێ بە دی نەکراوە.

نموونە: فەرمودەی عمرو بن شمر الجعفي الكوفي الشيعي، عن جابر عن أبي الطفيل عن علي و عمار قالا: كان النبي صل الله عليه و سلم يقنت في الفجر، و يكبر يوم عرفة من صلاة الغداة و يقطع صلاة العصر اخر أيام التشريق.

نەسائی و دارە قوتنی و غەیری ئەمانەش دەربارەی ( عمرو بن شمر ) ووتویانە کەسێکی (متروك الحديثة) واتە گێڕنەوەی لێ وەرناگیرێت.

## ٣٢- والكذب المختلق المصنوع على النبي فذلك الموضوع

### موضوع

لە بەتەکە دا روون و ئاشکرایە کە دەلێت ئەو درۆ و ساختەی لە خۆیان دەرهێناوە و دەیدەنە پاڵ پیغەمبەری خۆشەویست صل الله علیه و سلم، ئەوە پێ ی ئەوترێت: (موضوع) .

موضوع یش لە زمانەوانیدا: لە (وضع) هاتووە واتە شتێك بداتە پال کەسێکی تر و لە زاراوەدا: واتە درۆکردنی ڕاوی لە فەرمودە دا بە جۆرێك شتێك بداتە پاڵ رسول الله صل الله علیه و سلم کە ئەو نەیفەرمووە و ئەنجامی نەداوە و ئەم کارەش بە ئەنقەست بکات.

---

[٣٧] تيسير مصطلح الحديث، محمود الطحان ص. ٩٤

**بۆ نموونە:** وەك ئەوەی کە خەتیب لە ( تاریخ) دا دەگێڕیتەوە: لا بأس ببول الحمار و کل ما أكل ( واتە کیشە لە میزی گوێ درێژ نیە و هەر شتێك کە بخورێت. ئەوەی بە هەلبەستن تۆمەتبارە اسحاق بن محمد بن أبان النخعی یە .[38]

ئەمە بریتیە لە پیس ترین و خراپترین بەشەکان و هیچ فرێ بە سەر فەرمودەی پیغەمبەرمان صل الله علیه و سلم نیە و تەنیا بۆیە لە نێو باسی زاراوەی فەرمودە باس کراوە تەنیا بە مەبە ستی ڕوونکردنەوە.

## حوکمی موضوع:

لە هیچ شوێنێك بۆ هیچ مەبەستێك ناگێردرێتەوە، ئێنجا چ لە ئەحکام بێت یا چیرۆك و هاندان بۆ چاکە، و گێرانەوە لە خراپە یا فەزلەکان، و زانیان کۆدەنگن کە ناکرێت بۆ هیچ مەبەستێك بگێڕدرێتەوە تەنیا بۆ یەك مەبەست نەبێت ئەویش ئەوەیە ڕوون بکرێتەوە کە ئەمە فەرمودە نیە و هەلبەستراوە بۆ ئەوەی خەلکی لێ ی بە ئاگا بن و خۆی لێ بپارێزن.

ترسناکی هەلبەستن و بوختان کردن بە زاری رسول الله صل الله علیه و سلم، لە فەرمودەیەکی صەحیح دا روون کراوەتەوە:

انه قال صل الله علیه و سلم " من حدث عنی بحدیث یری أنه کذب فهو أحد الکاذبین" موسلیم لە پێشەکی صەحیحەکەی ریوایەتی کردووە، واتە هەر کەسێك فەرمودەیەك لە من بگێرێتەوە و بۆی ئاشکرا بێت کە ئەمە درۆیە ئەوا ئەو کەسەی دەیگێرێتەوە یەکیك لە دوو درۆزنەکانە.

هەروەها ئەو فەرمودە بە ناوبانگە، کە پیغەمبەری خۆشەویستمان صل الله علیه و سلم فەرمویەتی: " من کذب علی متعمدا فلیتبوأ مقعدة من النار" رواه بخاری ، واتە هەرکەسێك درۆ بە زاری منەوە بکات با جێگەی خۆی لە ناو ئاگری جەهەنەم خۆش بکات ( خوا بمان پارێزێت).

لە پێناو خۆپاراستن لەم هەرەشەیە و ووریا بوون لە تێکەوتن و هەلە کردن لە فەرمودەکانی رسول الله صل الله علیه و سلم ئەوا زۆرێك لە هاوەلان رەزای خوایان لە سەر بێت، کەم ریوایەتیان کردووە و بگرە هەندێ جار ڕێگریشیان کردووە لە زۆر ریوایەت کردنی فەرمودە، مەبادا توشی هەلە بن لە گێڕانەوەی فەرمودە. نمونەش هەرەشەی ئیمامی عومەرە رەزای خوای لێ بێت لە ئەبو هورەیرە کە واز بهینیت لە زۆر ڕیوایەت کردن ئەمەش مەبەست لێی گومان نەبووە لە سەر راستگۆیی و ئەمانەت داری ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێت بەلکو مەبەستی دوو شت بووە:

<u>یەکەم</u> نزیك بوون لە سەردەمی دابەزینی قورئان بۆ ئەوەی فەرمودەکان لە گەل قورئان تێکەل نەبێت خەلکی لێیان تێکەل نەبێت.

<u>دووەم</u>: دلسۆزی و پەرۆشی خەلیفەکانی رسول الله صل الله علیه و سلم، لە سەر ئەمانەتی فەرمودە بە نرخەکان و پارێزگاری کردن و گرتنە بەری خۆپاریزی و ووریا بوون لەوەی نەوەك زیاد و کەم بخرێتە ناوی.

---

[38]سامسونیة في شرح البیقونیة، أبو عبدالله لیث الحیالي، ص. ٩٩

بۆیە پێش ڕیوایەت کردنی هەر فەرمودەیەك، دەبێ ئێمە هەموومان زۆر ووریا بین و هەر چی کەوتە بەر دەستمان نەیگێڕینەوە تا دلنیا نەبین لە فەرموده و شیوازی گێڕانەوە و ڕاست بوونی سەنەدەکەی و دەقەکەی و بەیان کردنی هەر کەم و کورتیەك گەر لە سەنەد و ڕاویەکان هەبیت.

دیارە هەندێ لە زانایان لە پێناو جیاکردنەوەی مەوزوعەکان لە فەرمودەکانی تر، کتێبیان داناوە هەندێکیان تایبەتە بەوە و هەندێکی، تر لا بە لا لە دوو توێی کتابی گشتی مەوزوعاتیان دەستنیشان کردووە. بە ناوبانگ ترین کتابەکانیش لەم بوارە ئەمانەن: موزوعاتی ئیبن جەوزی رەحمەتی خوای لی بیت. بەلام وەك ابن عثیمین رەحمەتی خوای لی بێت لە ڕاڤەکردنی خۆی بۆ مەنزومەی بەیقونی دەلێت: مەرج نیە پشت بە کتابی ئیبن جەوزی ببەسترێت سەبارەت بە مەوزوعات ( واتە بە ڕەهایی و بێ لێکۆلینەوە) لە بەر ئەوەی ئیبن جەوزی (متساهل) بووە لەمەوزوعات، واتە هەندێ جار ئەو فەرمودانەی کە گەورە زانایان بە ڕاستیان داناوە یا ئەو پەری لای ئەوان لاواز بووە، ئیبن جەوزی بە هەلبەستراوی لە قەلەم داوە و لە کتابەکەی دا هێنایتەوە.

**هۆکاری دانانی مەوزوعات و هەلبەستن بۆ چەند شتێك دەگەریتەوە:**

- لەوانە: دەمارگیری لە سەر مەزهەب و دانانی هەلبەستراو بۆ پشتگیری کردن لە مەزهەبی خۆی.
- ناوازە بوون و دیار کەوتن.
- بە گۆتەی خۆیان برەودان بە کار و کردەوەی باش، تەنانەت گەر بە هۆی هەلبەستراویك بیت، کە ئەمە پاساویکی بۆگەنە و دین پێویستی بە درۆ و هەلبەستن نیە بۆ کاری چاکە و ئەوەی هەیە لە فەرمودە صەحیحە کان بەسمانە و پێویستی بە شتی ترنیە.
- قین لە دل بوون لە ئیسلام و موسلمانان و شێواندنی دین و ڕەواج دان بە شتی خورافیات و فیتنە و دەلەسە بە ناوی دین و هەلبەستنی درۆ بە زاری رسول الله صل الله علیه و سلم.

| | |
|---|---|
| ٣٣- وقد أتت كالجوهر المكنون | سميتها: منظومة البيقوني |
| ٣٤- فوق الثلاثين بأربعة أتت | أبياتها ثم بخير ختمت |

## كوتايى مەنزومە

لە كۆتايی دا، دانەری ئەم نەزمە جوانە دەلێت وەك گەوهەری پارێزراو ئەم مەنزومە هاتووە و ناوم لێ ناوە بەيقونی، كە لەقەبی خۆیەتی و دەلێت ژمارەی بەیتەكانی سی و چوار دانەیە و كۆتایی پێ دێت.

الحمدلله بۆ الله تعالى كە هاوكارم بوو بۆ نوسینەوە و شیكردنەوەی ئەم مەنزومەیە

لە ئێوارەی رۆژی یەك شەممە ٠٥ جمادى الاولى ١٤٤٢ كاتژمێر ٣:٤٦ نوسینی ئەم نامیلكە زانستیە بە كۆتا هات.

خزمەتكاری قورئان و سونەت

عبدالرحمن شمس الدين نزاری

# مافی لە بەرگرتنەوە و چاپ و بلاوکردنەوە

مافی لە بەر گرتنە وە و چاپ پارێزراوە بۆ دانەر ( **وەقف کراوە فی سبیل الله بۆ ئەکادیمیای پاشکەوتەکانی سونەت بۆ زانستە شەرعیەکان**) بە پێ ی مەرجی دانەر.

بەلام فەقی و زانستخوازەکان بۆ خۆیان و هاوپۆلیەکانیان بۆیان هەیە استنساخ ی لێ وەرگرن بۆ خۆیان و خویندنی شەرعی.

تێبینی: شیکردنەوەی مەنزومەی بەیقونی لە لایەن دانەری ئەم پەرتوکە بە شیوازی تۆماری دەنگی لە ٥ وانە هەیە و ئەوەی بیەویت دەتوانیت سود مەند بێت و لە کەنالی ذخائر السنة للعلوم الشرعية دەستی دەکەوێت.

خوای تعالی پاداشتی ئیوەش بداتەوە کە کاتتان تەرخان کرد بۆ خوێندنەوەی ئەم پەرتوکە.

تکایە لە هەر کەم و کوریەك ئاگادارمان بکەنەوە.

## هۆکارەکانی پەیوەندی:

   **07507658019**

  
عبدالرحمن النزاری
أكادمية ذخائر السنة للعلوم الشرعية

 **Abdulrahman160877@gmail.com**

# ناوەرۆك: